# خوێندنەوە

## بەرنامەو پەیڕەوی ژیانە

د. راغب السرجانی
هادی شارباژێڕی



خوێندنەوە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانە
د.راغب السرجانی
هادی شارباژێڕی

# خوێندنەوە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانە

نووسینی:
دکتۆر راغب سەرجانی
وەرگێڕانی:
هادی شارباژێڕی

# خوێندنەوە
# بەرنامەو پەیڕەوی ژیانە


نوســــــــــــــــینی: د. راغب سرجانی
وەرگێڕانـــــــــــــی: هادی شارباژێڕی


بڵاوکردنــــــــــەوەی: زادی ڕێمان
ســـــــــــــــاڵی: ٢٠١٨ز-١٤٣٩ھ
قەبـــــــــــــارە: ١٧*٢٤

لە بڵاوکراوەکانی ماڵپەری زادی ڕێمان
زانکۆی ئازادی دیراساتی ئیسلامی زادی

## پێشکەشبێت:

به هاوبیران و هاوڕێیانی ڕێبازی ڕێگەی خواویستی...

**هادی شارباژێڕی**

بسم الله الرحمن الرحيم

إِنَّ الحَمْدَ للّٰهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنا وَمِنْ سَيِّئاتِ أعْمَالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللّٰهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. أَشْهَدُ أنْ لَا إِلٰهَ إِلَّا اللّٰه وَأَشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ وَرَسُولُهُ.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا * يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا

أمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كِتابُ اللّٰهِ، وَخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمد صَلَى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ

وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلَالَةٍ فِي النَّارِ.



# ناوەڕۆك

ناوەڕۆک ........................ ٦
(خوێندنەوە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانە) ........................ ٧
چۆن خوێندنەوەم خۆشبوێت؟! ........................ ٢٥
هۆکاری یەکەم : نییەتپاکی ........................ ٢٥
هۆکاری دووەم : پلاندان بۆ خوێندنەوە ........................ ٢٩
هۆکاری سێیەم : جێگیر کردنی کاتی دیاری کراو بۆ خوێندنەوە ........................ ٣١
هۆکاری چوارەم : لە پلەبەندی لە خوێندنەوەدا. ........................ ٣٢
هۆکاری پێنجەم : لێهاتووی و بەتوانایی ........................ ٣٣
هۆکاری شەشەم : ڕێکخستنی زانیاریەکان، کارکردن بەبەرنامە ........................ ٣٥
هۆکاری حەوتەم : دروستکردنی کتێبخانەیەکی هەمەجۆر لە ماڵەکەتدا ........................ ٣٦
هۆکاری هەشتەم : ئەوەی ئەی خوێنیەوە و فێری دەبیت بیگەیەنە بۆ خەڵکانی تر ........................ ٣٩
هۆکاری نۆیەم : هاوکاری و هەرەوەزی ئەنجام بدە لە خوێندنەوەدا : ........................ ٤٠
هۆکاری دەیەم : دیاری کردنی مەنهەجێک بۆ خوێندنەوە : ........................ ٤١
چی بخوێنمەوە ؟ ........................ ٤٤
وەرن لەگەڵمدا بیربکەینەوە چی بخوێنینەوە ؟ ... ........................ ٤٤
بواری یەکەم : قورئانی پیرۆز ........................ ٤٥
بواری دووەم : فەرمودەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم : ........................ ٤٦
بواری سێیەم : خوێندنی زانستی شەرعی ........................ ٤٨
بواری چوارەم: خوێندنەوە لە بواری تایبەتمەندێتی (التخصص) ........................ ٥٣
بواری پێنجەم : کە بوارێکی زۆر گرنگە ئەویش بواری مێژوو (التاريخ). ........................ ٥٤
بواری شەشەم : خوێندنەوە لە بواری و اقیعناسی ........................ ٥٧
بواری حەوتەم : خوێندنەوە لە بواری بیروڕای جیاواز ........................ ٥٨
بواری هەشتەم : خوێندنەوە لەبواری ئەو گومانانەی کە دەوروژێندرێت دەربارەی ئیسلام ... ٦٠
بواری نۆیەم : خوێندنەوە لە بواری پەروەردەکردنی منداڵ ........................ ٦٢
بواری دەیەم و کۆتایی : خوێندنەوە لە بواری لاوەکی و کات بەسەربردن. ........................ ٦٣
چەند وتەیەکی وەرگێڕ لە کۆتاییدا ........................ ٦٥

## (خوێندنەوە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانە)

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله...**

**أما بعد...**

زۆر کات گوێبیستی خەڵکی دەبین کە پرسیار لەیەکتری دەکەن ئارەزووت چییە لە ژیاندا ؟

بەدڵنیایەوە ئەگەر سەرنج بدەین وەڵامەکان جیاوازن، هەندێك خەڵکی ئارەزوویان مەلەکردنە، هەندێکی تر ڕاوکردنی ماسییە، هەندێکی تر گەشت و سەیران...

بەدڵنیاییەوە هەموو مرۆڤێك ئارەزوویەکی تایبەت بەخۆی هەیە، ئارەزووەکانیش لەنێوان مرۆڤەکاندا جیاوازن، بەڵام کاتێك لە کەسانێك بپرسین: ئایا ئارەزووتان چیە لە ژیاندا؟ ئەوانیش لەوەڵامدا بڵێن: ئارەزوومان خوێندوەیە!!

لەڕاستییدا ئا ئەم وەڵامە بۆ زۆرێکمان مایەی سەرسوڕمانە، کاتێك کەسێك بڵێت ئارەزووم خوێندنەوەیە !!

بۆ نموونە کەسێك بڵێت ئارەزووم ئاو خواردنەوەیە ! ڕاستەوخۆ ئەو پرسیارە لە بیرماندا دروست دەبێت کە هەموو کەس ئاو دەخواتەوە چونکە ئاوخواردنەوە پێویستی ژیانە، یان کەسێکی تر بڵێت ئارەزووم نان خواردنە بەهەمان شێوە دەڵێین ئێ هەموو کەسێك نان دەخوات چونکە پێویستی ژیانە نەك ئارەزوو ! هەرکات مرۆڤ هەستی بە برسێتی کرد نان دەخوات.

بەهەمان شێوە بۆ نوستن و هەناسەدان و...هتد، ئەمانە بێ هیچ گومانێك لە پێویستیەکانی ژیانن، هەرکەس ئەم کارانە نەکات ناتوانێ بەردەوام بێت لەژیان، من پێم وایە خوێندنەوەش هەر وایە لە پێویستیەکانی ژیانە نەك ئارەزووەکان،کەوایە بێ هیچ گومانێك ناکرێ مرۆڤ نەخوێنێتەوە. پێویستە کە دەخوێنێتەوە بەتەنها کتێبێك یان دوو کتێب نەبێت،یان بەتەنها ڕۆژێك لەحەفتەیەکدا یان مانگێك لە ساڵێکدا... بەڵکو پێویستە خوێندنەوە بریتی بێت لە (بەرنامەو پەیڕەوی ژیان).

هەرگیز ناکرێ ڕۆژێکت لێ بڕواتوو نەت خوێندبێتەوە، وە خوێندنەوەکەش وەنەبێ هەرچی بوو بیخوێنیتەوە بەڵکو پێویستە خوێندنەوەیەکی دروست و سوودبەخش بێت، خوێندنەوەیەك بێت داتمەزرێنێت نەك دادڕمێنێت،... چاکسازبێت نەك وێرانکەر..

جـا کەوایـە بـەڕێزەکانم خوێندنـەوە ئـارەزوو نیـە، شـتێکی چـاوەڕوان نـەکراوە ئەگـەر گوێمـان لـە کەسـێك بێـت بڵێـت: مـن خۆشـیم لـە خوێندنـەوە نایـەت!، یـان نەبۆتـە خولیـام، یـان چێـژ لـە خوێندنـەوە وەرناگرم، ئەم قسـەیە بەڕاستی وەك ئەوەیە بڵێی: من چێژ لە خـواردن وەرناگرم ئایە شتی وادەگونجێت !!

ئەگـەر هەڵوێسـتەیەك بکـەین چاوێـك بخشـێنین بـە هەنـدێك لـە قۆناغـەکانی ژیاننامـەی پێغەمبـەر (صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ )؛ ئـەوا دەبینین بایـەخێکی زۆر بـە خوێندنـەوە دراوە، هـەر لەوەشـەوە جـارێکی تر بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خوێندنەوە ئارەزوو نیە بەڵکو و بەرنامەو پەیڕەوی ژیانە...

هـەر بـۆ نموونـە ئەگـەر ووردبینـەوە لـەو کاتـەی کـە جوبرەئیـل (علیـە السلام) هاتە لای پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، تاکە وشـەیەك کە سەرەتای وەحی بوو بۆی هێنابوو بریتی بوو لە وشـەی (اقرأ) (بخوێنە) ! خۆ بەدڵنیاییەوە دەگونجا کە بێجگە لەم وشـەیە (اقرأ) وشـەیەکی تری هێنابووایـە، ئـا ئـەم قورئانـە کـە بـەدرێژایی مـاوەی بیسـت و سێ سـاڵ هاتـەخوارەوە، تاکـە وشـەیەك کـە بـووە دەسـتپێکی ئـەم قـورئانـە پیرۆزە ووشـەی (بخوێنە)بوو!.

لەگـەڵ ئـەوەی کـە پێغەمبـەر صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ بـۆ خـۆی خوێنـەواری نـەبوو !، بـەڵام هـەر ئـەم وشەیەشـی ئاڕاسـتەی کـرا، لەکاتێکیشـدا نەی دەتـوانی بخوێنێت و بنوسێت،دەبێ ئەوەش بزانین کـە پێغەمبـەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ خـاوەنی دەیـان سـیفەتی بـەرزو تایبەتمەنـدی جـوان و بەنرخـە،کـە دەگونجـا بـە وشـەیەك دەسـت پێبکـات کـە گوزارشـتی لـە بـەرزی و بـەڕێزی ئـەو پێغەمبـەرە میهرەبانـە بکردایە، بەڵام چونکە کۆتا وەحی و کۆتا پەیامی پێغەمبەران بوو، هەر بـۆیە زۆر بـە ئاشـکراو بـە کـورتی پـەیامی ئومـەتی موسـڵمان لەیـەك وشـەدا کۆکرایەوە، ئەو وشـەیە بەرنامەو پەیڕەوی ئوممەتی موسڵمانە کە (اقرأ) واتە: (بخوێنە).

پێغەمبـەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ نـەی دەزانـی چـۆن بخـوێنێ و وە چی بخـــوێنێ، بۆیـــە زۆر بـــە ڕونـــی وەڵامـــی دایـــەوەو فـــەرمووی: مـــن خوێنـدەوارنیم، واگومانیشـی دەبـرد کـە ئـەو وەڵامـە بـەس بێـت لەبـەر ئەوەی سـەرەتا کە جوبرەئیل علیە السلام بەوە دەستی پێکرد پێی وابوو دەچێتـە سـەر بابـەتێکی تـر یـان زیـاتر بـۆی ڕون دەکاتـەوە کـەچی لـەم دەوێ، بەڵام جوبرەئیل علیەالسلام باوەشی کرد بە پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ ) بەشـێوەیەکی تونـد بەخۆیـەوە گوشی هـەتا بزانێ کـە شـتێکی گرنگی پێـدەڵێت، پاشـان هـەمان ووشـەی دووبـارە کـردەوە و فەرموی اقرأ (بخوێنە)..

بەبێ ئەوەی هیچ ووشە یەکی تر زیاد بکات، وە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نەی دەزانی چی دەوێ لەم،وەمەبەستی چییە لەم ڕەفتارانە، تەنانەت نەشی دەزانی ئەم کەسە کێیە و چۆن هاتۆتە ئەم شوێنە ؟! پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێشتر ئەم کەسەی نەدیبوو بۆیە لای نامۆ بوو، کاتێکییش بینی هەمان ووشە دووبارەدەکاتەوە دەفەرمووێت (إقرأ)، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بۆ جاری دووەم فەرموی من خوێندەوار نیم... وە جوبرەئیل بەهەمان شێوە توند باوەشی کرد بە پێغەمبەرداو صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ هەتا بزانێ کە شتێکی گرنگی پێ دەڵێت و پاشان فەرموی بۆ جاری سێیەم (إقرأ) بخوێنە، پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموی من خوێندەوار نیم...

ئیتر لە دوای جاری سێیەم جوبرەئیل پەیامەکەی فەرموو ووتی : (ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ( ١) خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ( ٢) ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ( ٣) ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ( ٤) عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥ )).

واتە: (ئەی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە. (١) ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردووە. (٢) بخوێنە، لەکاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە. (٣) ئەو

زاتەیــە کــە بــەهۆی قەڵەمــەوە زانســتی و زانیــاری فێــر کــردووە. (٤) ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیوون. (٥)

جوبرەئیــل پــێش ئــەوەی بــە پێغەمبــەر صَــلَّى اللَّهُ عَلَيْــهِ وَسَــلَّمَ بفــەرمووێت: مــن فریشــتەی نێردراوی خــوای گــەورەم، وە جــەنابت ســەیدنا محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ پێغەمبەری خـوای، وە ئەمـەی کـە خوێندمــەوە قورئانــە... پــێش ئــەوەی بڵــێ ئەمــە دینێکی نوێیــە کــە ئیسلامە، پێش هەموو ئەم شتانە (بە شێوازی فەرمان (ئەمر)) پێی فەرمووو: (إقرأ) "بخوێنە" .

ئەمــەش بەڕاســتی ئاماژەیــەکی ورد و ڕوونــی تێــدایە بــۆ ئوممــەتی موسڵمان!

ئایـا دەگـونجێ یەکـەمین وشـەی قورئـان کـە دابەزیوەتـە سـەر زەوی وشـەیەك بێـت گوزارشـت لـە ئـارەزوو بکـات هەنـدێك کـەس حـەزی پێبکـەن و هەنـدێکی تـر لێی ڕابکـەن یـان هەنـدێکی تـر زۆر بەلایانـەوە گرنگ نەبێت ؟!

قورئـان زیـاد لـە حـەفتاو حـەوت هـەزار وشـەیە، لـەناو ئـەو هـەموو وشانەدا تاکە وشەیەك کە "إقرأ"(بخوێنە) یە و سەرەتای قورئانە ئایا ئەمە جێگەی تێڕامان نیە ؟

لەکاتێکدا لە قورئاندا هەزاران فەرمان و بەرهەڵستی هەیە وەك : أقم الصلاة، اتوا الزكاة، وجاهدوا فی سبیل الله، و أمر بالمعروف، نه عن المنكر، اصبر علی ما أصابك، أنفقوا مما رزقناكم، توبوا إلی الله... زۆری تر هەن لە قورئانی پیرۆزدا کە ناکرێ لێرە هەمووی دابنێین، جا بزانە بەرێزەکەم لەناو ئەو هەموو فەرمان و بەرهەڵستیەدا خوای گەورە یەکەمین فەرمان بە "إقرأ" دەستی پێکرد !

وە هەر بەوەشەوە نەوەستاوە کە تەنها یەك جار ئەو فەرمانەی بەو وشەیە کردبێت، بەڵکو پێنج ئایەتی سەرەتای قورئان لەو سورەتەدا گوزارشت لە بابەتی خوێندنەوە دەکات، وە وشەی "إقرأ" دووجار دووبارە دەبێتەوە لەو پێنج ئایەتە...

ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ( ١) خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ( ٢)

پاشان دەفەرموێت (ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ) پاشان (ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ)... وە باسکردنی قەڵەم بە دیاری کراوی بۆ ئەوەیە ئەو فەرمانەی کە (بخوێنەیە) بە ڕوون و ئاشکرای ئامانجەکە دیار بێت کە خوێندنەوەیەك باس دەکات کە دەنوسرێت بە قەڵەم، نەك خەڵێك وابزانێ مەبەستێکی تری شاراوە یان مەجازی هەیە،بەڵکو زۆر بە ڕونی لەو ئامانجەت دەگەیەنێ کەمەبەستیەتی...

لەدوای ئەم باس و خواسانەی کردمان جێی خۆیەتی کە پرسیار لە خۆمان بکەین : بۆچی بخوێنینەوە ؟ وە ئایا خوێندنەوە هۆکارە یان ئامانج ؟

لەوەڵامدا دەڵێین خوێندنەوە هۆکارە، ئێمە کە دەخوێنینەوە بۆ ئەوەیە فێربین، خوای گەورە زۆر بە ئاشکرا لەو پێنج ئایەتەی سەرەوە کە هێنامانەوە دەفەرموێ : ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥. لەمەوە دەتوانین بڵێین خوێندنەوە هۆکارە، چونکە ئەگەر وانەبوایە خوای گەورە سەرەتای قورئانی وشەی فێربونی دائەنا نەك خوێندنەوە، بەڵام ئاشکرایە کە خوێندنەوە هۆکارە بۆ فێربون، هەر لەبەر ئەوەیە دەبێت سەرتا هۆکارەکان بگرینە بەر پاشان ئامانجەکە بەدەست دەهێنین...

گومان لەوەدا نیە کە هۆکار زۆرن بۆ فێربوون بۆ نموونە (گوێگرتن، بینین، ئەزموون، شارەزایی)... بەڵام هۆکاری گەورە و گرنگ بریتیە لە خوێندنەوە، وە خوای گەورە دەیەوێ فێرمان بکات کە لەناو هەموو ئەو هۆکارانە بۆ فێربوون، خوێندنەوە لە پێش هەموویانەوەیە.

خوای گەورە لەو پێنج ئایەتەدا دوو خاڵی زۆر گرنگمان بۆ دیاری دەکات بۆ خوێندنەوە :-

یەکەم : خوای گەورە دەفەرموێ " ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ"... پێویستە کە دەخوێنینەوە سەرەتا بەناوی خوای گەورە (بسم الله) دەست پێبکەین نەك بخوێنینەوە بە بێ ئەوە، یان شتێك بخوێنینەوە کە خوای گەورە بەرهەڵستی لێکردووە، دەبێت خوێندنەوەیەك بێت لەسەر بەرنامەو پەیڕەوی خوای گەورە، خوێندنەوەیەك بێت کە سودی بۆ مرۆڤایەتی و ئاوەدانکردنەوەی زەوی، وە چاکەی دونیاو قیامەتی تێدابێت، ئەمما خوێندنەوەیەك بێت لەسەر شتی بێکەڵك و لارو گومڕایی، ئەمە بەڕاستی ئەو خوێندنەوەیە نیە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە لەم ئایەتە : ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ...

ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە...

خاڵی دووەم : ئەو کەسەی دە خوێنێتەوەو فێری زانست دەبێت، ناکرێت لە خۆی بگۆڕێت و لووت بەرزی بەرامبەر خەڵکی ئەنجام بدات، بەڵکو خوای گەورە بیرمان دەخاتەوە کە هەرچی تۆ دەیزانی و فێری دەبیت لە خوای گەورەوەیە، وەك دەفەرموێت : ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ (٣ )ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ(٤)

عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ (٥).

لەم ئایەتەوە خوای گەورە ئەوەمان فێردەکات بەخۆت مەنازە کە بویتە خاوەن زانست و بیرو فکری بەهێز، چونکە ئەگەر بگەیتە پلە بەرزەکانی زانستیش ئەوا باش بزانە خوای گەورەیە فێری کردوی...

خوای گەورە دەفەرموێ : واتقوا الله ويعلمكم الله.. واتە: لەخوای گەورە بترسن وە هەر خوای گەورەشە فێری زانست و زانیاریتان دەکات.

وە هەروەها لەم ئایەتەش دەفەرموێ :"وما أوتيتم من العلم إلا قليلا" واتە : هیچتان پێنەبەخشراوە لە عیلم و زانست تەنها شتێکی کەم نەبێت.

هەرگیز خۆت بەگەورە مەزانە بەوەی کە شت دەزانیت بەرامبەر کەسێك کە نازانێ.

سەرەتاکانی وەحی وێنایەکی زۆر مەنهەجی و پتەو بۆ فێرخوازی زانست دیاری دەکات، فێر ی دەکات کە ئەبێت دان بەوەدا بنێیت کە هەرچی زانست هەیە لە نیعمەت و میهرەبانی خواوەیە، وە ئاراستەشمان دەکات بەوەی کە خوێندنەوەکەشمان بەو ئاراستەیە بێت کە خوای گەورە لێی ڕازییە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ لاپەڕەکانی سیرە هەڵوێستێکی تری زۆر جوان و ناوازە دەبینین کە بۆ ئەو سەردەمەی ئەو کات و سەردەمی ئێستاشمان نموونەیەکی جوان و جێی تێڕامانە.

نمونەکە بریتیەلەو کافرانەی کە لەشەڕی بەدردا بەدیل گیران لای موسوڵمانەکان.

پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ داوای لە دیلەکان کرد کە بۆ ئەوەی ئازادیان بکات هەر دیلێك دە موسوڵمان فێری خوێندنەوەو نووسین بکات !! بەڕاستی داواکاریەکی زۆر سەیرە بەتایبەت بۆ ئەو سەردەمە کە خەڵکەکە زۆری گرنگیان بە خوێندن نەداوە...

بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کە خوێندنەوەو نووسین و فێربوون یەکێکە لە پێویستیە گرنگەکان بۆ هەر ئوممەتێك بیەوێت ڕۆشنبیر بێت و شۆڕش بکات و پێشبکەوێت...

ئەگەر تەماشایەکی بارودۆخی ئەو کاتی موسوڵمانان بکەین لە ڕۆژانی جەنگی بەدردا دەبینین موسوڵمانان ئەوەندەی پێویستیان بە پارەو خواردن و وە هەڵگرتنی دیلەکان لای خۆیان تا بیکەنە فشارێك بۆ سەر قورەیشیەکان، یان گۆڕینەوەی دیلەکان بەرامبەر دیلی موسوڵمانان ئەگەر هەبوبێت، ئەوەندە پێویستیان بە خوێندنەوەو

نووسین نەبووە، بەڵام پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وای بەباش زانی و ئەوەی لا گرنگ بوو کە موسوڵمانان فێری خوێندنەوەو نووسین بن...

ئەمەش بەڕاستی خاڵێکی زۆر گرنگە،کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بیری کردۆتەوە بناغەی ئوممەتەکەی بناغەیەکی پتەو وە بەهێز و گشتگیرو تەواو بێت...

هەتا ئەگەر یەکێك لە هاوەڵەکان توانای خوێندنەوەی هەبوبێت پێش هاوەڵێکی تری خستووە، زەیدی کوڕی ثابت ڕەزای خوای لێبێت یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە خوێندەوار بووە و پێش زۆرێك لە هاوەڵەکانی تری خستووە، بەردەوامیش لەگەڵ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بووە چونکە توانای خوێندنەوەو نوسینی زۆر باش بووە، وە نوسەری وەحیش و خوێنەری ئەو نامانەبووە کە هاتوون بۆ پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بە زمانی سریانی و عیبری،و نووسەری ئەو نامانە کە پێغەمبەر دەی نارد، لەکاتێکدا تەمەنی زەید سێزدە ساڵان ساڵ بووە !!

هەمووман دەزانین ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێبێت کە چۆن بووە لە لەبەرکردندا، یەکێکە لەو هاوەڵانەی زۆرترین فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەبەر بووە، بزانن چی دەڵێت دەربارەی خۆی کە

لە بوخاریدا هاتووە : "مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِلَّا مَا كَانَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ ".

واتە :"کەست دەست ناکەوێ لەناو هاوەڵانی پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زۆرترین فەرموودەی لابێت وەك من، مەگەر عبدوالله کوڕی عومەر کە ئەو دەینووسیەوە من نەم دەنوسی ".

ئەگەر تێبینی بکەین ئەوەی عەبدوالله کوڕی عومەری بەرز کردەوەو هێنایە ئەو پلەیەی کە یەکێك بێت لەو هاوەڵانەی فەرمودەی زۆری لابوبێت، ئەوەبوو کە خوێندەوار بوو.

ئەم هەڵوێستەو بەدەیان هەڵوێستی تر هەن کە گوزارشت لە وەدەکەن خوێندنەوە و نووسین خۆشەویستی و بناغەیەکی زۆر بەهێزی هەیە لە دڵی موسوڵماناندا.

کتێبخانەی ئیسلامی بەدرێژای مێژووی ئیسلام گەورەترین کتێبخانەبووە لە جیهاندا، گەورەترین ئەو کتێبخانانە کە سەدان ساڵ درێژەی کێشاوە : کتێبخانەی " بەغداد، قورطوبە، ئیشبیلیا، غەرناطە،قاهیرە، دیمەشق، تەرابلوس، مەدینە، قودس... " مێژوویەکی زۆر درێژ لە ڕۆشنبیری و شارستانیەت و زانست...

ئائەمەیە لوتکەی خوێندنەوە لە تەرازوی ئیسلامدا..

ئائەمەیە نموونەی خوێندەواریی لە مێژووی موسوڵمانان..

لەگەڵ هەموو ئەو مأێژووە پیرۆزە و بەنرخە لە خوێندنەوە کە ئوممەتی موسوڵمان هەی بووە، زۆر بەداخەوە ئەمڕۆ نەخوێندەوارییەکی زۆر خراپ باڵی کێشاوە بەسەر ئوممەتی قورئان، ئوممەتێك یەکەمین ووشەی دەستورەکەی "إقرأ" "بخوێنە"یە !!

ڕێژەی نەخوێندەواری کە مەبەست لەوەی نە بزانێ بخوێنێتەوە و بنووسێ لە ناو موسوڵماناندا دەگاتە ٣٧%...!!!

ئائەم ڕێژە زۆرە لە نەخوێندەواری لە جیهانی ئیسلامی بەڕاستی کارەساتە پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکەین و بەدوای چارەسەریدا بگەڕێین...

بێجگە لەم ڕێژەی ٣٧% کە نەخوێندەوارییەکی ئاشکرایە.

بەڵام چەند پلەیەکی تری نەخوێندەواریمان هەیە بە ناڕاستەوخۆ کە بڵاوبونەتەوە بە ناو ئوممەتدا بێجگەلەو نەخوێندەوارییەی کە نازانێ بنووسێ و بخوێنێتەوە.

ئەویش بریتیە لەو نەخوێندەوارییەی کە لەناو هەندێك لە خەڵکیدا هەیە ئەتوانێ بخوێنێتەوە و بنووسێ هەتا زانکۆشی تەواو کردووە یان خەڵکانێکمان هەیە شارەزاییەکی زۆری لە بواری مێژوو و زانستەکاندا هەیە گرنگی زۆریان داوە بە ژیانی دونیا و خەڵکی بەڵام زۆر نەخوێندەوارە دەربارەی دینەکەی...

تەنانەت هەندێك کەس هەن مامۆستای زانکۆن یان دکتۆری گەورە یان پارێزەرە لە پلە بەرزەکان، شارەزاییان نییە لە شتە سەرەتاییەکانی دین.

یەکێك لە مامۆستاکانی زانکۆ لەدوای ئەوەی هاو پیشەکەی گەڕابۆوە لە عومرە لێی پرسیبوو ئەرێ لەکاتی شایەتماندا چیتان وت ؟ ئایە فاتیحاتان خوێند ؟!! ئەمە مامۆستای زانکۆیە !!!.

ئافرەتێکی تر کە مامۆستای زانکۆ بوو بەهەمان شێوە دەڵێ: کە من لەگەڵ خێزانەکەم لەماڵەوە نوێژ بە کۆمەڵ دەکەین، جارێك ئەو پێش دەکەوێ جارێکیش من !!

خەڵکی ئاوا شارەزای نوێژن لەکاتێکدا نوێژ کۆڵەکەی دینە، ئەبێت بۆ فەرزەکانی تر چۆن بن ؟! ئەمە بەڕاستی نەخوێندەواریەکی ئاشکراو ڕوونە...

جارێك هەستام بە ئەنجامدانی پێش برکێیەك بۆ خوێندکارانی زانکۆ، یەکێك لە پرسیارەکان ئەوەبوو کە بە ڕیزبەندی ناوی خولەفای ڕاشیدین بڵێن، لەیەکەمەوە هەتا کۆتای کە چوار خەلیفەیە، بەڵام زۆر بەداخەوە یەك خوێندکار نەی توانی ئەو وەڵامە بەڕاستی جواب بدەنەوە.

هەندێك خەڵکی تر هەن نەخوێندەوارن لە بواری سیاسەت، نازانن چی ڕوئەدات لەم دونیایە، وە خەڵکی چۆن گوزەران دەکەن، نازانن چی ڕوودەدات لە فەلەستین لە عێراق، لە ئەمریکا لە ئەوروپا، هەتا نازانن لەو وڵاتەی کە تێیدا دەژی چی دەگوزەرێ !

هەندێکی تر لەخەڵکی نەخوێندەوارن لە یاسا و دەستور، نازانێت مافی چیە لەو کۆمەڵگەیە، وە ئەرکی چییە.

ئیتر بەشێوەیەکی گشتی لە زانستەکانی تریش...

خەڵکی ئەمڕۆ هەتا نا خوێنەوە دەربارەی شتانێك کە پەیوەندی هەیە بە ژیانی تایبەتی خۆیەوە، ئەوە ئەگەر بخوێنێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی یان لەو بوارەی خۆی یان ڕۆشنیری گشتی شتی وا دەگمەنە...

بەڕاستی ئەمە زۆر مەترسیدارە بۆ شارستانیەت..

لەکاتێکدا دەستپێکی دروست بونی ئەم ئوممەتە "إقرأ" ە

بەڵگەنەویستە کە ئەم ئوممەتە جارێکیتر هەستێتەوە بە بێ خوێندنەوە...

یەکێك لە کاربەدەستە یەهودیەکان دەڵێت : ئێمە لە ئوممەتی موسوڵمان ناترسین، لەبەرئەوەی ئوممەتی موسوڵمان ئێستا ئوممەتێکن ناخوێننەوە... بەڕاستی ئەو یەهودیە درۆزنە ڕاستی وتووە، هەر ئوممەتێك نەخوێنێتەوە ئەوا ئوممەتێکی بێ سام و بێ هەیبەت دەبێت...

کێشەیەکی تریش هەیە ئەویش بریتیە لەوەی کە زۆرێك لەگەنجان هەن کاتێکی زۆر ئەدەن بە خوێندنەوە،بەڵام خوێندنەوەکەیان دیاری کراو نییە، بۆنموونە نزیکی چەندین سەعات بەفیڕۆ ئەدەن لە خوێندنەوەی دەیان لاپەڕە لە هەواڵی وەرزشی، یان هەواڵی هونەری، یان خوێندنەوەی چیرۆکی سۆزداری و ڕۆمانی خۆشەویستی...

خۆی بەڕاستی ئەم کەسانە پیت و ووشەی زۆر دەخوێنەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی سودی هەبێت، دەیان سەعات و ڕۆژ و مانگ و ساڵ تێدەپەڕێ بەم جۆرە، دوای هەموو ئەو خوێندنەوانە چی دەبێت ؟ بێگومان هیچ !!

ئەمەش بەڕاستی کارێکی خراپە، ئەگەر خوێندنەوە بۆ ئامانجێکی گەورە بێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەبێت ئەوەی دەیخوێنیتەوە ئەو ئامانجە گەورەیەت بۆ بهێنێتە دی...

**کەواتە دوو کێشەی سەرەکی هەیە کە دەبێت بیان خەینە ڕوو:**

یەکەم: هەندێك لە خەڵکی ناتوانن خوێندنەوە بکەنە خولیای ڕۆژانەیان، یان خێرا بخوێنەوە، یان تەمەڵی دەکەن لەخوێندنەوە و بەردەوام نابن، ئەم جۆرە کەسانە پێویستە ئەو هۆکارانەیان بۆ دیاری بکەین کەدەبێتە هۆی ئەوەی خوێندنەوەیان لا خۆشەویست بێت تا لەم کێشەیە ڕزگاریان بێت...

دووەم: هەندێکی تر لە خەڵکی دەخوێننەوە زۆر بەباشی، وەکاتێکی زۆریش ئەدەن بە خوێندنەوە، بەڵام خوێندنەوەکەیان بۆ ئامانجێکی دیاری کراو نییە، وە ناشزانن چی دەخوێننەوە بۆیە خوێندنەوەکەیان جێگەی خۆی ناگرێت و بێ سود ئەبێت، ئەم جۆرە کەسانە پێویستە ئاڕاستە بکرێن بۆ بابەتی بەسودو ئامانجدار...

هەوڵەدەین لە بەشەکانی دواتردا وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەینەوە، بە پشتیوانی خوای گەورە.

## چۆن خوێندنەوەم خۆشبوێت ؟!

لێرەدا دە هۆکارمان دەست نیشانکردووە بە پشتیوانی خوای گەورە کە ببێتە هۆی خۆشویستنمان بۆ خوێندنەوە :

**هۆکاری یەکەم :** یەکێکە لە هەرە هۆکارە گرنگەکان بە شێوەیەکی گشتی، ئاگادار بوونە لە نیەت، ئامانج چییە لە خوێندنەوە ؟ وە بۆچی ئەخوێنمەوە ؟

من ئەخوێنمەوە لەبەرئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردوم بخوێنمەوە، وە خوای گەورە بە شێوازی فەرمان بەهەموو موسوڵمانان دەفەرموێت ڕاستەوخۆ "إقرأ" کەواتە خوێندنەوە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوایە...

ئەخوێنمەوە بۆ ئەوەی سودمەند بم لە دونیاو ڕۆژی دوایی، هیچ سەرکەوتنێك نیە لەدونیا بەبێ زانست، وە بەهەمان شێوەش بە بێ زانست لە ڕۆژی دوای سەرکەوتن بەدەست ناهێنی...

ئەخوێنمەوە بۆ ئەوەی سود بەوانەی دەوروپشتم بگەیەنم، بە دایك و باوك و منداڵ و برا و خوشك و خزم و هاوڕێکانم، ئەوەی دەی ناسم و ئەوەی نای ناسم.. کاتێك کە دەخوێنیتەوەو سود بە دەوروبەرت دەگەیەنی وەك کەسێك وایت کە هەڵگری بۆنی

(میسـکە)،هـەر کـەس بەلایـدا تێپـەڕێ سـود لـەو بۆنـە خۆشـەی وەردەگرێت...

ئەخوێنمـەوە بـۆ ئـەوەی سـود بـە ئوممەتەکـەم بگەیـەنم، چونکـە ئوممەتەکـەم ئێسـتا ناخوێنێتـەوە، هـەروەك لەپێشـتر باسـمان کـرد هەرئوممـەتێك نەخوێنێتـەوە سـام و هەیبـەتی نابێـت، ئـەو ئوممەتـە لـەکاروان دوادەکـەوێت، ئـەبێت بـە شـوێن کەوتـەی بێجگـە لـەخۆی، کەوایـە دەخوێنمـەوە بـۆ ئـەوەی ئوممەتەکـەم پـێش ئوممـەتانی تـر بکەوێت...

تۆ بەخوێندنەوە ڕەزامەنـدی خـوای گەورە بەدەسـت دەهێنیت، خـۆت لێی سـودمەند دەبیـت، خۆشەویسـتەکانت لێی سـودمەند دەبـن، وە ئوممەتەکەشـت لێی سـودمەند دەبێـت...بـەبێ هـیچ گومانێـك ئائـەم پاڵنەرە گەورانە هەست و ویژدانت دەوروژێنێت بۆ خوێندنەوە...

ئائەمـەت هەمیشـە لـەبیربێت کـە نیـەتت بـۆ خـوای گـەورەبێت و ئـەو خاڵـە سـەرەکیانەی کـە لـە سـورەتی (العلـق) دا باسـکراوە لەبـەرچاوت بێـت، تـۆ بزانـە کـە بـە (بسـم الله) دەسـت دەکـەیت بەخوێندنـەوە ئەمەش پلەیەکی بەرزە لە خوێندنەوە، وە ئەوەشت لەیاد بێت هـەرگیز خـۆت بەگـەورە مەزانـە کـە دەخوێنیتـەوەو فێردەبیـت، لەبـەر ئـەوەی

هەرچی فێری دەبین لە گەورەی و ڕەحمەتی خوای گەورەوەیە و منەتی ئەوە بەسەرمانەوە...

ئەمەش یەکەمین و گرنگترین هۆکارە کە هانمان ئەدات بخوێنینەوە، کە بریتی بوو لە ئاگاداربوون لە نیەتمان و دیاری کردنی ئامانج، پێداگری لەسەر ئەم هۆکارە کۆمەڵێك مەبەستی گرنگ دەپێکێت، ئەویش بەدەست خستنی پاداشتی ڕۆژی دوای بۆ خوێندنەوەی هەر زانستێکی بەسود، بەهەر ووشەیەك کە تۆ دەیخوێنیتەوە مادام نیەتت بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورەیە...

لەبەر ئەوەی خوێندنەوەکەت بۆ ئامانجێکی دیاری کراوە ئەمەش بیرو فکرێکی باشترت بۆ بەدەست دەخات، وە هەروەها چێژێکی ڕاستەقینە وەردەگری لەو شتانەی دەی خوێنیتەوە...

خۆ مەرج نییە هەر بە خوێندنەوەی زانستی شەرعی چێژ وەربگیرێ لەخوێندنەوە، بەڵکوو لەهەموو زانستەکان هەر وایە، ئەو کەسەی دەخوێنێتەوە لەبواری سیاسەت چێژی خۆی وەردەگرێ، لەبواری مێژوو یان ئابووری لەهەموو ئەو بوارانەی کە سودە دەبەخشن خوێنەر چێژ وەردەگرێ لێی...

ئـەی باشــە بـۆ خوێنـدکاران لـەم چێـژە کـە لەخوێندنـەوە هەیـە لێی ڕادەکـەن، بـەردەوام کێشـەهەیە لـەنێوان بـاوك و دایـك و مامۆسـتاو خوێندکار،مامۆستاو باوك و دایکەکان زۆر لـە خوێنـدکارەکان دەکـەن کە بخوێننەوە...

ئەگـەر ئاڕاسـتەکردنی خوێنـدکارەکان بەشـێوەیەکی ڕاسـت و دروسـت بێت و نوێکردنـەوەی نییـەت و دیاری کردنی ئامـانجی تێـدابێت، ئەوا بـە دڵنیایـەوە ئـەو هـەموو ڕۆژ و مانـگ و سـاڵە ی هەیـە بـەفیڕۆ ناچێـت، خوێنـدکار لـە دوای شانزەسـاڵ یـان حەڤدەسـاڵ لـە خوێنـدن کاتێـك تـەواو دەبێـت نەخوێنـدەوارە لــە ڕووی زانسـتیەوە !! بەڕاسـتی ئەمـە کارەسـاتە بـە فیڕۆچـونی ئامانجـە، زانایـانی بـواری کـارگێڕی (الإدارة) جەخت لەوە دەکەنەوە بەردەوام یەکەمین کار کە پێویستە بکرێت لە هــەر پرۆژەیــەك لــە ژیانــدا، ئەگــەر بتــەوێ ســەرکەوتوبیت ئــەوا ئامانجەکەت بە ڕوونی دیاری بکە.

**هۆکـــاری دووەم :** ئـەویش پـلان دانانــە بــۆ خوێندنــەوە، نــاکرێ بــە شێوەیەکی هەڕەمەکی بخوێنینـەوە، پێویسـتە پلانێکی ڕوونمـان هـەبێت بـۆ خوێندنـەوە، گرنگـە کـە بەشـێوازێکی زۆر باشـە بخوێنینـەوە نـەك هەر تەنها خوێندنەوە بێت وەك چاو پیاخشاندن، کاتێکی باش دابنێی بۆ خوێندنەوە، وە کتێبێکی گونجاو، کە لەو کاتەدا تواناى وەرگرتنت هــەبێت نــەك هــیلاك و مانــدوویت، ئــەبێت ئەوەشــمان بیرنــەچێت هەموو کات بزانین کە بۆچی دەخوێنینەوە...

لەدوای زانینی ئەم شتانەی باسمانکرد پێویستە پلانێکی ڕوون دابنێین لـە ژێـر سـایەی توانـاو کاتی دیـاری کـراو بـۆ خوێندنـەوە، بـۆ نموونـە ئەتەوێ پێنج کتێب بخوێنیتەوە لە ماوەی شەشە مانگی داهاتوو، یان بیسـت کتێـب بخوێنیتـەوە لـەماوەی سـاڵێك یـان دوو سـاڵی داهـاتوو، پاشــان بێیــت دیــاری بکــەیت بــۆ نموونــە کتێــبی فــلان لــەو ماوەیــەدا تەواوی دەکەم، دوای فلان کتێبیش لەو ماوەیەی تردا، ئەوەش بزانە دەبێت پابەندبیت بەو پلانەی دای ئەنێیت، ناکرێت بیگۆڕی مەگەر لە کاتێکی نەخوازراودا کە توشت دەبێت، لەسەرەتادا ماندوو دەبیت بە جێبــەجێکردنی پلانەکــەت، بــەڵام لەدوایــدا بــە پێــداگریت لەســەر پلانەکـەت سـەرکەوتوو دەبیـت، هـەوڵیش بـدە پلانەکـەت وا نـەبێت بتکاتـە واقعێکی واوە کـە توشـی ناڕەحـەتیت بکـات بـا پلانەکـەت مـام

ناوەنـد بێـت، وامەکـە لـەماوەی کـاتێکی کـەم دەیـان کتێـب دابنێی بـۆ خوێندنـەوە و سـەرکەوتوش نـەبیت و بـاش لێیـان تێنەگـەیت، خۆشـت توشی ئـازارو بێزاری دەکـەیت، بەهـەمان شـێوەش ئـەوەش هەڵەیە کە کـاتێکی زۆرت لەبـەر دەسـتایە و کتێبێکـی کـەمت دانـاوە، ئەمـەش بەفیڕۆدانی کاتە.

پاشـان هەوڵبـدە کە مانگانـە چـاودێری پرۆژەکـەی خـۆت بکـەی بزانیـت ئایـا پابەنـدی بـە پرۆژەکـەوە یـان دوا کـەوتووی، ئەگـەر سـەیرت کـرد پابەنـد نیـت بـەو کاتـەی دات نـاوە،ئـەوا بزانـە کێشـەکەت لـە چیـدا بـۆ دروسـت بـووە،ئایە پلانەکـەی دات نـاوە هەڵەیـە، یـان پلانەکە لەگـەڵ تواناو کاتی تـۆدا ناگونجێت، هـەرکام لەمانـەبێت پێویسـتە چارەسـەری بـۆ بدۆزیتـەوە، بـەردەوابوونت لەسـەر ئـەم جـۆرە چـاودێری کردنـە لەسـەر ئـەو پلانـەی داتنـاوە بـۆ خوێندنەوەکـە ڕێـژەی سـەرکەوتنت لـە بەرزیدا دەبێت ان شـاء اللە، ئەمەش هۆکاری دووەم بوو لە هۆکارەکانی چـۆن خوێندنـەوەم خـۆش بوێـت، لـەدوای دیـاری کردنـی ئامـانج، بریتیەلە چۆنیەتی پلانەکەت...

**هۆکاری سێیەم : جێگیر کردنی کاتی دیاری کراو بۆ خوێندنەوە و سود وەرگرتن لەکاتە زیادەکەن :**

ئەمەش بەواتای ئەوەی هەتا ڕۆژەکانی کۆتای بەرنامەکەت پابەندبیت بەکاتەکانەوە هەتا خۆشویستنت بۆ خوێندنەوە بەردەوام بێت، وە ئەوەش ڕەچاوبکە کە ئەو کاتەی هەڵی دەبژێری بۆ خوێندنەوە با باشترین کاتەکانت بێت، واتا کاتێك بێت بیروهۆشت چالاك بێت، هەتا لە کاتی خوێندنەوەکە زۆرترین سود بیبینیت.

بۆنمونە کاتی دوای نوێژی بەیانی هەتا هەڵهاتنی خۆر کاتێکی باشە بۆ خوێندنەوە، یان پێش بانگی شێوان بە سەعاتێك، یان لە نێوان شێوان و خەوتناندا، یان لەدوای نوێژی خەوتنان ڕاستەوخۆ، ئەمانە هەموی کاتی باشن و کاتی تریش کە خۆت پێی ئاسودەی لە خوێندنەوە.

هەروەها سود وەرگرتن لەوکاتە زیادانەی هەتە بۆ خوێندنەوە، بۆنمونە لەکاتێکدا لەسەر کارەکەتی و دەستت بەتاڵەو کارت نیە ئەتوانی لە مۆبایلەکەت یان کتێبێکت پێبێت ئەو کاتەی هەیە بەکاری بهێنی بۆ خوێندنەوە، یان لە ناو پاسدای یان لەسەفەردای کاتەکەت مەهێڵە بە زیادە بڕوات بەڵکو لە خوێندنەوەدا بەکاری بهێنە، یان لەکاتێکدا لە چاوەڕوانی سەردانی دکتۆردای یان هەر شتێکی تر ئەوا کاتەکە بەفیڕۆ مەدە، ئێستاش ئەتوانیت لەڕێگەی مۆبایل یان ئای پاد

دەیـان کتێـب و سـەرچاوە بخەیتـە ناویـان و لـەو کاتـە زیادانـەدا بیـان خۆێنیتەوە.

**هۆکاری چوارەم : ئەم هۆکارەش گرنگی خۆی هەیە ئەویش برتییەلە پلەبەندی لە خوێندنەوەدا.**

هەنـدێك لـە خوێنـەران سـەرەتا کەدەسـت پێدەکـەن زۆر بـە گـەرم و گــوڕی دەســت ئەدەنــە خوێندنــەوە، هیمــەتێکی باشــیان هەیــە و پەلەدەکـەن لـە کڕینی کتێبێکی زۆر، وە ڕاسـتەوخۆ دەسـت ئەکـەن بـە خوێندنـەوەیان، کاتێکی زۆر ئـەدەن بـە خوێندنـەوە هـەتا ئـەو کاتانـەی تـری کارو ئیشـیان ئـەدەن بـە خوێندنەوە، بـەڵام ئەمە کارێکی بـاش نیـە پێویسـتە خوێندنـەوە بـە پلەبەنـدی بێـت، چونکـە ئـەم دینـە بۆخـۆی بـەهێزە و قوڵــە پێویســتە لەســەر خــۆ داخڵـی بـین، بەنــەرم ونیــانی هـەنگاوەکان بنێین، بەتایبـەت لـە بـواری خوێندنـەوەدا، هـەتا لەسـەر دەروونــت قــورس نــەبێت و توشــی ناڕەحــەتی و مەلــەل نــەبیت، خوێندنـەوە پێویسـتی بـە وەسـتانوو لەسـەر خـۆ ڕۆیشـتنە، هـەروەك یـاریزانی ڕاکـردێن کـە سـەرەتا دەسـتپێدەکات بەهێواشی و لەسـەرخۆ ڕادەکات پاشـان وردە وردە خێراییەکـەی زیـاد دەکات، چونکە دەزانێـت ماوەکـەی درێـژە ناکرێـت هـەر لەسـەرتاوە بـە خێـرای دەسـتپێبکات، ئەگـەر وابکات ناگاتە نیوەی ڕێگاکە و دەوەستێت، خوێندنەوەش هـەر وایـە چونکـە پەیوەسـتە بـە بەرنامـەو پـەیڕەوی ژیانـەوە، کەوایـە ئەگـەر

خوێندنەوەت کرد بە بەرنامەی ژیانت دەبێت بە لەسەرخۆو بە عەقڵێکی فراوانەوە لەگەڵی بڕۆیت هەتا بە پشتیوانی خوای گەورە بەردەوام بیت تا کۆتای مەنزڵگا...

**هۆکاری پێنجەم : لێهاتووی و بەتوانایی**

هەرلەسەرتاوە ئاماژەمان دا بەوەی کە خوێندنەوە ئارەزوو نییە، بەڵکوو کارێکی گرنگ و شایەنە، وە پێویستی بە بیرو فکرێکی بەهۆشەو وە کاتێکی باش و هەوڵوتێکۆشانی بەردەوام، ناکرێت ئەم جۆرە کارانە بە کەم تەرخەمی وەربگیرێت، تۆ کاتێك دەخوێنیتەوە ئەبێت رەچاوی ئەوەبکەیت بۆ هەر وشەیەك بیروفکری تێدا بەکاربهێنیت، وەسودو قازانجی لێوەربگری، کەوایە خوێندنەوە بزانە کە کارێکی گەورەیە هەرگیز ئەم کارەش پشتگوێ مەکەو کەم تەرخەم مەبە تیایدا.

وە ئامۆژگاریشم بۆ ئێوە ئەوەیە کە هەرکاتێك کتێبێکتان خوێندەوە بەگرنگی و بە دڵسۆزیەوە بیخوێنەوە، واهەستبکە کە تاقیکردنەوە دەکەیت لەوکتێبەداو پاشان هەمووکاتێك با دەفتەری تێبینی و ئەو شتانەی گرنگن و سودوو قازانجی زۆرە بیان نوسەو دەوریان بکەرەوە، تا بۆ هاوڕێیان و خۆشەویستانتی بخوێنیتەوەو سودوو قازانجیشی بۆ ئەوان تێدابێت، یان ئەگەر لەباسێکدا تێنەگەیشتی لای خۆت تۆماری

بکەیت و پاشان کەکەسێکی گونجاوت دەستکەوت پێی بڵێیت تا بۆت ڕوونبکاتــەوە، هــەرگیز کتێــب وامەخوێنــەوە کــە گۆڤارێــك یــان ڕۆژنامەیـەك دەخوێنیتـەوە، بەدڵنیایـەوە ئەگـەر لەسـەر ئـەم شـێوازە بـەردەوامبیت ئـەوا بـەردەوام لـەکاتی خوێندنـەوەدا تـەرکیزو وریایـت دەبێـت و زانیاریـەکانیشی کـەدەیان خوێنیتـەوە لات دەمێنێتـەوە و بیرت ناچێتـەوە، دوای ئـەوەی کـە بـەم شـێوەیەت کـرد هەسـت بـەخۆت ئەکەیت کەبەرەو پێشچوویت لەڕوی زانستی و فکریەوە...

ئەگەر چاوێك بخشێنینەوە بە ژیان نامەی هاوەڵان و تابعین و زانایانی موسـوڵمان ئـەوکات بـۆت دەردەکـەوێت مانـای لێهـاتووی چییـە، وە مەبەستیشـمان لـە لێهاتووبوون چییە، بگەڕێوە بۆ ژیانی زەیدی کوڕی ثابـت (ﷺ)، وە عەبـدواللە کـوڕی عـەباس (ﷺ)، وە ئیمـامی شـافیعی و ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل و خـەواریزمی و جـابری کـوڕی حـەییان ڕەحمـەتی خـوا لەهـەمویان بێـت، کـە ژیـانی ئـەم پیـاوە گەورانـە دەخوێنیتـەوە ئـەوکات دەزانیـت کـە هەوڵـدان و تێکۆشـانی ئـەمان لـەو پـەڕی لوتکەدایـە بـۆ خوێندنـەوەو فێربـوون بـەتواناو هێزێکـی زۆر سەرسـوڕهێنەر بـەردەوام بـوون، وە پـاك و بێگـەردی بـۆ ئـەو خوایـەی کە دروستی کردووین بە جوانترین شێوە...

**هۆکاری شەشەم : ڕێکخستنی زانیاریەکان، کارکردن بەبەرنامە.**

دانـانی بەرنامـەو ڕێکخسـتنی کاروبارەکـانی ژیانـت پێویسـتیەکی ژیانـە، هەوڵبـدە لەژیانتـدا هەمیشـە بـە بەرنامـەو ڕێکووپێکی کاروبارەکان جێ بەجێ بکەیت، وەك لەپێشتر ئاماژەمان پێکرد با هەمیشە دەفتەرێکت هـەبێت تـا زانیاریـەکانی تێـدا بنوسـیتەوە دوای ئـەوەی کـە کتێبێکـت خوێنـدەوە، چونکـە موسـوڵمان دەبێـت کارەکـانی بـە بەرنامـە بێـت، بادەفتەرێکت تایبەت بێت بە زانستە شەرعیەکان، دانەیەکی ترت بۆ زانسـتە سیاسـیەکان، وە دانەیـەکی تـر بـۆ بابەتـە ئەدەبیـەکان، وە چـوارەم بـۆ بابـەتی مێژوو هتـد...، وە هەوڵبـدە کـە کتێبخانـەو شـوێنە تایبەتەکانی خۆت زۆر بە جوانی و ڕێك و پێکی دایان بنێی هەتا لەکاتی گـەڕانت بـەدوای شـتێکدا ئاسـان دەسـتت بکـەوێت، بەمەش کـاتێکی زۆرت بۆ دەگەڕێتەوە.

ئەم جـۆرە شـێوازە لە ڕێکـوپێکردنی کارەکانـت و شـوێنە تایبەتەکـانی خـۆت و کتێبخـانەکەت، بیـرو فکرێکـی ڕاسـت و دروسـتت پـێ دەبەخشـێت، هەنـدێک لە خەڵکـی هەوڵـدانەکانیان زۆر نـا ڕێـک و شـپرزەیە، زانیـاریەکی لە ڕۆژهەڵاتەو زانیـاریەکی لە ڕۆژ ئـاوایە، هـیچ وورد بینیـیەک و بەرنـامە ڕێـژیەک لە کاروبارەکانیانـدا بەدی ناکرێـت، بەڵام ئەوانەی کاروبارەکانیـان بەڕێـک و جـوانی تەرتیـب دەکەن و زانیاریەکان لە شوێنی گونجاودا هەڵدەگرن، بەدڵنیایەوە ئەمانە دەبنە

خـاوەن عەقڵێکی دروسـت، بـۆ هەمـوو کارێکیـان کە ئەنجـامی ئەدەن وردەکـارانە لێی دەچـنە پـێش، هەر بـۆیە لەو ئامـانجەی مەبەسـتیانە دورنـاکەونەوە، نـاچن کۆمەڵێـک بـابەتی زۆر لە خۆیـان کـۆبکەنەوەو سـەریان نەپەرژێتەسـەر هیچیـان ، ئەمەش بە ڕاسـتی بە خۆڕاهێنـان و پشــوودرێژی دێـتە دی، وە بەرهەمـی ئەم کارەشــت زۆرو پـڕپەرەکەت دەبێت...

مـن ئێسـتا هەنـدێک لەو وانـانەی کە ئامادەیـان دەکەم پـێش دەسـاڵ یـان پانزەسـاڵ لەسـەر وەرەقە نوسـیومە ئێسـتا کە سـەیریان دەکەم سـودی لێ دەبیـنم بـۆ حـازر کردنی وانەکانی ئێسـتام، ئەمەش لەدوای فەزڵی خـوا هی ئەو ڕێـک و پێکـردنەی ئیشـەکانە، کە بەبەرنامەسـازی زانیاریەکانم هەڵگرتـووەو پاراسـتومن، بەڕاسـتی ئەم جـۆرە تەنسـیق و هاوســەنگیە لە ژیــان و کارەکانــدا نەفســیەتێکی ســەنگینت پــێ دەبەخشێت لەگەڵ خۆت و خەڵکیشدا.

**هۆکاری حەوتەم : دروستکردنی کتێبخانەیەکی هەمەجۆر لە ماڵەکەتدا**

بـائەم پـرۆژەیەت گرنگترین پرۆژەبێـت لە ژیـانی خۆتـدا کە ئەنجـامی بـدەیت، هەروەک چـۆن ژن و مێرد بیردەکەنەوە کە ماڵیـان پـێکەوە نـا ژورێکی نوسـتن و ژورێکی میوانیـان هەبێـت، بەهەمـان شـێوەش تـۆش ئەوە بـکە بنـاغە کە مـاڵەکەت ژورێکی تـایبەت بێـت بە کتێبخـانەکەت ئەگەر لە تواناتــدا بــوو، ئەمەش بەراســتی وا لێــی مەڕوانە کە

دروســتکردنی کتێبخــانەیەک لە مــاڵەکەت شــتێکی لاوەکی بێــت نــا بەڵکوو با شتێکی سەرەکی بێت لە ماڵەکەتدا، گرنگی بەوەش مەدە کە پێکهــاتەی کتێبخــانەکەت لە کەرەســتەی پێشــکەوتوو یــان جــوان و بــریقەدارو رازاوە بێــت، بەڵکــوو گرنــگ ئەوەیە چی جــۆرە کتێبێکــی تێدایە!...

پێویســتە ئەوەت لە بیرو خەیاڵــدا بێــت کە پــرۆژەی کڕینی کۆمەڵێــک کتێبــی گرنــگ و چــاک بخەیــتە بــواری جێبەجێکــردنەوە، وە ئەم قســەیەش تەنهــا مەبەســتمان ئەو کەســانە نــیە کە دەوڵەمەنــدن بەڵکوو ئەوەی مەژارەو ئەوەشی دەوڵەمەندە بە پێی توانای خۆی، هیچ گومان لەوە نیە کە تۆ بتەوێ کۆمەڵێک کتێب بەدەست بهێنێ ئەبێت بڕێکی باش پارەت بۆ کۆکردبێتەوە، مەرجیش نیە بەیەک جار بچیت کتێبێکی زۆر بکڕیت و ئەو قورساییە بخەیتە سەرشانی خۆت ئەتوانی وردە وردە دەستیان پێبکەیت، هەر بۆنمونە ئەگەر بتەوێ خواردنێک بخۆی لەدەرەوە یان پارچەیەک جل بکڕی ئێ خۆی نرخی ئەو خواردنە یان ئەو جلانە لە نرخی سێ کتێب بۆ چوار کتێب زیاترە، یان جاری وایە گەشــتێک ئەنجــام ئەدەیــت کە نرخی لە دەیــان کتێــب زۆرتــرە، مەبەست لەم قسانە ئەوەیە کە ئێمە هەوڵبدەین لەو شتانەی ڕۆژانە بەدەستی دەهێنین بڕێک لابدەین بۆ کڕینی کتێب کە ئەمەش ووردە

ووردە دەکاتە نرخی دەیان کتێب و کتێبخانەیەکی باشت دەبێت لە ماوەی چەند ساڵێکدا ...

هەوڵبدە کە کاتێک ئیش لەسەر دروستکردنی کتێبخانەکەت دەکەیت، با کتێبخانەکەت هەمەجۆر و گشتگیربێت لە هەموو جۆرەکانی زانست، ئەگەر چی بۆ هەر بوارێک لە بوارەکانی زانست کتێبێکت هەبێت ئەوەش زۆر باشە، هەتا ئەگەر پێویستیت کەوتە شتێک لە بوارێکدا با تۆ کتێبێکت هەبێت لەو بوارەدا، لەدوای خوێندنەوەی ئەو بوارەی خۆت هەڵتبژاردووە کە دەتەوێت تایبەتمەندی وەربگریت تیایدا، لەکاتی خوێندنەوەدا هەستت کرد بەرەو ماندووبوون و بێزاری دەچیت،وچانێک وەربگرەو بچۆ سەر کتێبێکیتر لە بوارێکی جیاوازتر، وەهەروەها ئەوەش بزانە کە ئەم کتێبخانەیەی تۆ بونیادی دەنێیت بۆت دەبێتە خەیرێکی نەبڕاوە بۆ سود گەیاندن بە منداڵەکانت و نەوەکانی دوای خۆت.

((بۆ ... لەگەڵ ... کێ )): ئەمانە هۆکارەکانی هەشتەم و نۆیەم و دەیەمە، کە پەیوەندیان پێکەوە هەیە.

**هۆکاری هەشتەم : ئەوەی ئەی خوێنیتەوە و فێری دەبیت بیگەیەنە بۆ خەڵکانی تر.**

پێغەمبەر صلى الله عليەو وسلم دەفەرموێت (بلغو عني ولو آية ) واتە : لە منەوە بیگەیەنن بە خەڵکی ئەگەر ئایەتێکیش بێت، مرۆڤ پێویستە لەسەری کە ئەوەی فێری بووە بیگەیەنێ بە خەڵکانی تر هەروەک چۆن خەڵکی ئەمیان فێرکردووە، ئائەمەش بەڕاستی سود و قازانجێکی زۆر گەورەی تێدایە بۆ هەموو لایەک، ئەو زانستەی خوێندوتەوە بەم گەیاندنە بە خەڵکی زیاتر جێگیرتر دەبێت لە بیرو فکرتدا، چەندین سودی ترت دەست دەکەوێت لەو فێرکردنەی خەڵکی، مرۆڤ ئەو زانستەی کە فێری بووەو بەدەستی هێناوە، لە کاتی فێرکردنی خەڵکیدا ئەوەندەی تریش فێردەبێت بێ ئەوەی لە زانستەکەی خۆی کەم بکات، ئەمە بێجگەلەوەی کە خوای گەورە بەرەکەت ئەخاتە زانستەکەتەوە بەوەی خەڵکی فێردەکەیت، هەمیشە ئەم وتەیە بیرخۆمان بهێنینەوە کە دەڵێت ( هەرکەسێک کارێک بکات بۆئەوەی خەڵکی فێربکات خوای گەورە فێری دەکات لە زانستی خۆی بێ ئەوەی لە زانستی فێرخواز کەم بکات ).

هەموو فێرکردنێکی خەڵکی هەر شتێک بێت کە سودی بۆ مرۆڤ تێدابێت خوای گەورە زانستیت زیاد دەکات.

﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ [البقرة: ٢٨٢].

**هۆکاری نۆیەم : هاوکاری و هەرەوەزی ئەنجام بدە لەگەڵ هاوڕێکان و براکانتا لە خوێندنەوەدا :**

هەوڵبدە کە خۆت و هاوڕێکانت گروپێک دروست بکەن کە لە سێ کەس یان چوار یان پێنج کەس پێک بێت ... ناوی بنێن گروپی خوێندنەوە، هەموو جارێک هەریەکەتان بوارێک هەڵبژێرێت کە تیایدا بخوێنێتەوە، جا لە ماوەی حەفتەیەکدا یان دوو حەفتەدا لە شوێنێک کۆببنەوەو هەریەکەو ئەو کتێبەی خوێندویەتیەوە باسی بکات بۆ هاوڕێکانی، بەمەش گواستنەوەی زانیاری لەنێوان خۆتاندا زۆر دەبێت و زانیاریەکانیش لە بوارە جیاجیاکاندا دەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی پێشکەوتن و ڕۆشنبیریەکی چاک لەهەریەکەتاندا لە ماوەیەکی کەمدا، ناکرێت مرۆڤ تەنها لەیەک بواردا بخوێنێتەوەو خۆی ڕۆشنبیربکات، بەڵکو دەبێت بوارێک هەڵبژێرێت کە خۆی تیادا تایبەتمەند بکات و پاشان هەوڵبدات لە بوارەکانی تریشدا زانیاری هەبێت، ئەبێت ئەوەش بزانیت کە هەمیشە عەقڵی دووکەس باشترە لە یەک وە عەقڵی سێ کەس باشترە لە دوو چونکە ئەو زانیاریەی کە بەتەنها لای کەسێکە کەمترە لەوەی کە لای چەند کەسێکە، ئەکرێ تۆ لە بوارێکدا زۆر باشبیت بەڵام هاوڕێکەت لە بوارێکی تردا باشترە بەمەش هەریەکەتان سود بەیەک دەگەیەنن، ئینجا ئەوە لەکوێ ئەگەر ئێوە پێنج کەس بن بەدڵنیایەوە زۆر زیاتر سود مەند دەبن، وە شەیتانیش ناتوانێ زاڵ بێت بەسەرتاندا ئەگەر دووکەس بن وە کە

بوونە سێ کەمتر دەتوانێ ئیتر ئەگەر بوونە چوار و پێنج بەدڵنیایەوە زۆر کەمتر...

**هۆکاری دەیەم : دیاری کردنی مەنهەجێک بۆ خوێندنەوە :**

**ئەوەش دەبێت لە زانایانی وەربگریت یان لە وکەسانەی پسپۆڕن لەو بوارەی تۆ دەتەوێت تیایدا بخوێنیتەوە :**

هۆکاری هەشتەم بریتیبوولە گواستنەوەی زانست بۆ کەسانێک کە شارەزانین، لەهۆکاری نۆیەمدا تۆ لەگەڵ هاوڕێکانت و براکانتدا خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری و لەبەرکردنی ئەو شتانەی دەیان خوێنیتەوە ... ئەمما لێرەدا تۆ دێیت لە کەسانی زاناو پسپۆڕ زانیاریەکان وەردەگریت لە بوارەکەی خۆتدا، لێرەوە سەرەتایەک دەبێت بۆ تۆ تا بتوانی لەو بوارەی خۆتدا قاڵبیتەوە، پرسیار بکە لە کەسانی پسپۆڕ : چی بخوێنمەوە، وە بە چی کتێبێک دەستپێبکەم، وە باشترین کتێب لەو بوارەدا چیە بۆ سەرەتای دەستپێکردن، ئەگەر کتێبێکت خوێندەوە لەو بوارەی خۆتدا پرسیار بکە دوای ئەمە چیتر باشە بیخوێنمەوە، وەهەروەها بۆ دواتریش ...

زۆرێک لە خەڵکی کاتێکی زۆریان دەڕوات بە خوێندنەوەی کتێبی بێ سود یان خوێندنەوەی کتێبی قورس کە لە ئاستی ئەودا نیەو زۆر بەکەمیش سودی لێ دەبینێت، یان خوێندنەوەی کتێبی سادەو ساکار

وەک لە خوێنـدنەوەی کتێـبی فکریـی قـوڵ کە دەتوانێـت بیـرو فکـرت بەهێزبکات.

زانایانی پێشین هەروەک دەزانین زانستیان لە کەسانی تر وەرگرتووە، دەستیان کە داوەتە زانست و فێربون هەروەک ئەوانەی پێشتریش دەستیان پێکردووەو کۆتاییان پێ هێناوە، وە پاشان سودمەند بوون لەو زانستە، وە سودیشیان گەیاندوە بە خەڵکانی تر، هیچ کام لەو زانایانە لوتبەرزیان نەبووە بۆ فێربوون و هەوڵدان بۆ زانست و پرسیارکردن لە خەڵکی، وە زۆر تەوازعیان هەبووە کاتێک زانستیان وەرگرتوە لەهەر کەسێک بووبێت، ئائەم جۆرە ڕەوشت و ئاکارانە لە زانایانی گەورەی ئوممەتی ئیسلامدا نمونەمان زۆر زۆرە لە وانە ( بوخاری، ئیمامی نەوەوی، ئیبنولقەیم، ئیبنوتەیمیە ...) ئابەم شێوازانە گەیشتونەتە پلە بەرزەکانی زانست بە وەرگرتنی زانست و گەیاندنی بە خەڵکانی تر وە پاشان پەرەپێدانی زانستەکە لە خودی خۆیانداو هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامیان گەیاندونی بەو ئەستێرە درەوشاوانەی مێژووی بەرزی زانستخوازی لە ئیسلامدا... خوای گەورەش یارمەتیدەریان بووەو وە بونە هۆکاری هیدایەتی نەوەکانی دوای خۆیان.

ئەمـانە ی کە باسـمانکردن دە هۆکار بـون بـۆ یارمەتیـدانی خەڵکی تـا ببێتە بنەمایەک بۆ خوێنـدەوەی کتێب، وەبەردەوام بـون لەسـەری، وە سـودی لێببینێـت و زیـاتر وردتربێـت لە خـوێنـدنەوەدا، بەدڵنیـایەوە هۆکاری تر زۆرن کە باس بکرێت بەڵام ئێمە لێرەدا ئەم چەند خاڵەمان خسـتەڕوو کە هیـوادارم سـودی بووبێـت خـوای گەورەش پشـتیوانی هەموو لایەکمان بێت.

# چی بخوێنمەوە ؟

ئەگەر ئـێمە بڕیارمانـدا بخـوێنینەوە، وە ویسـتمان خوێنـدنەوەکەمان ئامانجـدار بێـت، لە کاتێکـدا وزەو تـاقەیەکی باشـمان پێـیە بـۆ خوێنـدنەوە، ئەو پرسـیارەی کەدەبێـت ئاڕاسـتەی خۆمـانی بکەیـن ئەوەیە کە : چی بخوێنینەوە ؟

**وەرن لەگەڵمدا بیربکەینەوە چی بخوێنینەوە ؟ ...**

هەنـدێک پێیـان وایە کە دەبێـت سـەرەتا لەهەمـوو جـۆرە جیاوازەکانی زانسـتی دینی بخـوێنیتەوە، مـن پـێم وایە کە ئەم جـۆرە بیرکـردنەوەیە مەبەسـتەکانی بەرنـامەو مەنهەجی خوێنـدنەوە نـین، چـونکە مرۆڤی موسـوڵمان بـۆ خـۆی کەسـایەتیەکی هاوسـەنگە، پێویسـتە خوێندنەوەکەشی هەمەجـۆر بێـت هەتـا بە هاوسـەنگی بمێنێـتەوە، وە ئیسـلام لەهەمـوو خاڵەکـانی ژیانمانـدا ڕۆڵـی هەیە، کەوایە دەبێـت خوێنـدنەوەکانمان لە بـوارە جیاوازەکانـدا بێـت، هەمـوو خوێنـدنەوەیەکیش لەهەر بوارێکـدا بێـت پێویسـتە سـودبەخش بێـت چونکە دەڵێن (خوێندنەوەی بەسود داواکراوە ) لە تەرازوی ئیسلامدا.

لەگەڵمـابن هەتـا پـێکەوە دە بـوار دیـاری بکەیـن بـۆ خوێنـدنەوە، ئەم بوارانەشی کە دیاریان دەکەین شتێک نیە کە قابیلی گۆڕانکاری نەبێت بەڵکو ئەمە سـەرەتایەکی ئاسـانە بـۆ ئەوانەی دەیـانەوێ دەسـت بکەن

بە خوێنـدنەوە بـۆ ئەوەی ڕۆشـنبیریان زیـاد بـکەن و ببـنە کەسـانێکی سود بەخش بۆ خۆیان و دەوروپشتیان.

**بـــــواری یەکەم :** یەکەمـــین شـــتێک کە بیخـــوێنینەوە و گەورەتـــرین خوێندنەوە و گرنگترین وشە کە ئێمە بیخوێنینەوە وشەکانی قورئانی پیـرۆزە، وە قورئـانی پیـرۆز کتێبێـک نـیە کە جارێـک یـان دووجـار بیخوێنینەوە، بەڵکو قورئان دەستوری ئێمەیە، خۆشەویستیمان بۆ قورئـانە دەبێـت وامـان لێبکـات بەردەوام بیخـــوێنینەوە و ببێـــتە سەرچاوەی ژیانمـان، هەتا هەندێک لە زانایان دەفەرمون کە خەتمی قورئـان لە مانگێکـدا یـان کەمتر لەمانگێکـدا موسـوڵمان ئەنجـامی بـدات، هیچ گومانیش نیە لەوەی قورئانی پیرۆز دەبێت لە بەرنامەی ڕۆژانەماندا هەبێت واتا هەموو ڕۆژێک لێی بخوێنینەوە.

ئەم قسـانەی کردمـان گرنگی تـایبەتی بە خـودی خۆمـانەوە هەیە، زۆرکات دەبینین هەندێک لە خەڵکی گرنگیەکی زۆر ئەدەن بە خوێندن و خوێندەوەی زانستە جۆربەجۆرەکان بەڵام خوێندنەوەی قورئانیان پشتگوێ خستووە، ئەمەش بەڕاستی شتێکی زۆر خراپە، خوای گەورە لە ڕەحمەتـی خـۆیەوەیە کە هانمـان ئەدات قورئـان بخـوێنینەوە، لە خوێنـدنەوەی هەر پیتێکی دە چاکەمـان بـۆ دەنوسـێت، لە کاتێکـدا قورئـان دەسـتورو ڕێبـازی ژیـانی ئێمەشـە، ئەمە گەورەتـرین نیعمەتی

خـوای گەورەیە بۆمـان، ئەوەی جێی سـەرنجیشـە ئەوەیە کە پیتێـک بە تەنها هیچ مانایەک نابەخشێت لە کاتێکدا خوای گەورە دە چاکەمان بـۆ دەنوسـێت، پێغمبـەر صلی الله علـیە وسـلم لە فەرمودەیەکەوە کە ئیمـامی ترمـزی بۆمـان دەگێـڕێتەوە دەفەرموێـت ( عــن عَبْـد اللَّهِ بْــن مَسْعُودٍ، قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ( مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لَا أَقُولُ الم حَرْفٌ، وَلَكِـنْ أَلِـفٌ حَـرْفٌ وَلَامٌ حَـرْفٌ وَمِـيمٌ حَـرْفٌ )، وصـححه الألبـاني في "صحيح الترمذي".

واتە : هەرکەسـێک پیتێـک بخـوێنێتەوە لە کتێبـی خـوای گەورە کە قورئـانە ئەوا چـاکەیەکی بـۆ دەنوسـرێت، وە ئەو چاکەیەشـی بـۆ دە ئەوەندە دەکرێت، وە ناشڵێم (الـم) پیتێکە، بەڵکو الـف پیتێکە وە لام پیتێکە وە میم پیتێکە.

**بواری دووەم : ئەویش لە مەبەستە گرنگەکانە کە فەرمودەکانی پێغەمبەرە صلی الله علیە وسلم :**

ئەمەی کە باسی دەکەین لە ڕاستیدا یەکێکە لە سـەرچاوە گرنگەکان کە سـەرچاوەی دووەمـی تەشـریعە لە دوای قورئـان ئەویـش فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، کە خوای گەورە (جوامع الکلـم) واتە قسـەی کـورت و پڕمانـای پـێ بەخشـیوە، دەبینـین فەرمـوودەی وا هەیە کە زۆر کورتە لە چەنـد وشـەیەک پێکـدێت بەڵام

پڕە لە زانست و سود و حیکمەت، کە هاوشێوەی ئەم سیفەتە لە قسەی هیچ مرۆڤێکیتردا بەدی ناکرێت، زۆرێک لەخەڵکی هەن کە قورئان دەخوێننەوە بەڵام فەرموودەکانی پێغەمبەر صلی اللهعلیە وسلم پشتگوێ دەخەن ئەمەش زۆر کارێکی هەڵەیە، هەندێکیتر هەن کە فەرمودەکان دەخوێننەوە بەڵام بەشێوەیەکی تێکەڵ و پێکەڵ ئەمەش هەر هەڵەیە دەبێت فەرمودەکانی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بکەینە بەشێکی سەرەکی لە خۆپەروەردەکردنمان و پێگەیشتنی خۆمان.

ئەگەر ئێمە بێین ڕۆژانە فەرموودەیەک یان دوو فەرمووودە بخوێنینەوە پاشان وردبینەوە لە مانای وشەکان و مانای فەرمودەکە ئەوا سودێکی زۆر گەورەمان دەست دەکەوێت لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، سونەتی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم گەنجینەیەکی زۆر گەورەیە بۆ ئێمە وە کتێبی فەرمودەش الحمدلله زۆرە، سەرەتا دەبێت لە ئاسانەکانەوە دەستپێبکەین بەشێوەی پلەبەندی، سەرەتا بۆ نمونە دەست دەکەین بە ( الاربعین النوویة )، پاشان ( ریاض الصالحین ) کە هەردوکیان هی ئیمامی نەوەویە، پاشان خوێندنەوەی کتێبی (اللؤلؤ والمرجان فیما اتفق علیه الشیخان )، پاشان بچیتەسەر پوختەکانی بوخاری و موسلیم ...

**بواری سێیەم : خوێندنی زانستی شەرعی**

بـۆ خوێنـدنی زانسـتی شـەرعی دەبێـت هەوڵبـدەی لای مامۆسـتایەک دەرسـەکان بخـوێنی ئەمە باشـترین شـتە، بەڵام ئەگەر ئەمەت بـۆ نەگونجـا ئەوا هەوڵبـدە لەلای زانـایەک یـان مامۆسـتایەکی شـارەزا لە زانستی شـەرعی مەنهەجێکت بۆ دیاری بکات بۆ خوێنـدنەوەی زانستە شـەرعیەکان، زانسـتی ئیسـلامی زۆر بـواری لە خۆگرتـووە، هەوڵبـدە لە هەر باخێک گوڵێک بچنیتەوە، وە باشـترە لەهەر بوارێک لە بوارەکانی زانسـتی شـەرعی کتێبێـک بخـوێنیتەوە هەتـا باکگراونـدێکی مەعریفـی باشـت هەبێـت لەسـەر هەمـوو زانسـتەکان، کەئەمەش دەبێـتە بنـاغەیەکی پتەو بـۆ دروسـتکردنی کەسـایەتی و پەروەردە بـونی خـۆت، لەسەرەتاشـدا دەسـتبکە بە خوێنـدنەوەی کتێبی بچـوک پاشـان بـۆ کتێبە گەورەکان و فراوانەکان.

لـێرەدا پـێم باشـە کە چەنـد نمـونەیەک لە کتێبەشـەرعیەکان دەستنیشـان بکەم هەتـا ببێـتە بنـاغەیەکی پتەو بـۆ خوێنـدنی زانسـتی شـەرعی [1] :

---

[1] لەکۆتای ئەم کتێبەدا چەند تێبینیەک نوسراوە دەربارەی مەنهەجی خوێندنەوەی زانستی شەرعی و ڕۆشنبیری زانستە ئیسلامیەکان کە داواکارم بە وردی بی خوێنەوەو هەوڵیشبدەن بەشداری بکەن لەو مەنهەجەدا (وەرگێڕ)

١-پوختەی تەفسیری ئیبن و کەثیر : ئەم تەفسیرە کتێبێکی نایاب و بە پێزە، کە هاتووە بە شێوەیەکی ئاسان و ڕوون نوسیویەتی، سەرەتا جوزئی عم و تبارک بخوێنیتەوە، پاشان بچۆ سەر سورەتەکانی تری وەک ( البقرة، الکهف، یس، الواقعة ...) خشتەیەکیش دابنێ و پێشیەوە پابەند بە بۆ خوێندنەوەی لە ماوەیەکی دیاری کراودا.[1]

٢-فقه السنة : بەشی یەکەمی کە باس لە ئەحکامەکانی ( نوێژ و زەکات و ڕۆژ و حەج ) دەکات، ئەم بەشانە زۆر گرنگن لەسەرەتاوە شارەزای ئەوەبیت کە پەرستنەکانت بە شێوەیەکی ڕاست و دروست ئەنجام بدەیت[2]

٣-کتێبی ئیمان : دکتۆر محمد نعیم یاسین، کە کتێبێکی ئاسان و زۆر باشە بۆ سەرەتاکانی فێربونی بیروباوەڕی ئیسلامی، نوسەر لەم کتێبەدا دەدوێ دەربارەی چۆنیەتی باوڕهێنان بە خوای گەورەو بە فریشتەکان و کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوای و وە باوەڕهێنان بە قەزاو قەدەر.[3]

---

[1] پێناچێت پوختەی تەفسیری ئیبن و کەثیر هەبێت بە کوردی لەبری ئەوە ئەتوانیت تەفسیری ( ڕامان یان ئاسان یان نامی پوختەکەی بەکاربهێنی ) وەرگێر.

[2] ئەم کتێبە کراوە بە کوردی بە سێ بەرگ

[3] ئەم کتێبەش کراوە بە کوردی

٤-مختصر منهاج القاصدين : کتێبێکی زۆر نایاب و چاکە دەربارەی باسەکانی تەزکیەی نەفس و باسە روحانیەکان و نەخۆشیەکانی دڵ و چارەسەرکردنیان، وە لەناوبردنی هەندێک ڕەوشتی ناپەسەندی وەک تورەی و رەزیلی ....، وە چۆنیەتی تەوبە کردن و خۆشویستنی خوای گەورە ... کتێبێکی نایاب و جوانە.[١]

٥-کتێبی خلق المسلم للشيخ الغزالي : باس لە بناغەی ڕەوشتی ڕەسەن دەکات کە دەبێت موسوڵمانان هەیان بێت.[٢]

٦-المرأة في التصور الإسلامي (ئافرەت لە دیدگای ئیسلامەوە ) دکتۆر عبدالمتعال الجبري ئەم کتێبە کتێبێکی زۆر نایاب و گرنگە باس لە پێگەی ئافرەت دەکات لە ئیسلامدا و وە ئەو گومانانەی دروستکراون لەسەر پێگەی ئافرەت لە دیندا، وە لامی گومانەکانیشی تێدایە، ئەم کتێبە بەتەنها بۆ ئافرەتان نیە بەڵکو پیاوانیش دەبێت بیخوێننەوە چونکە باسەکانی گرنگ و جێ بایەخن.[٣]

---

[١] وادەزانم ئەم کتێبە نەکرابێتە کوردی بەڵام بەدیلی ئەمە کتێبی (پەروەردەی دەروون یان بژاری دەروون ) بەکوردی هەن هاوشێوەی ئەم کتێبەن

[٢] ئەم کتێبە نەکراوە بەکوردی بەڵام هاوشێوەی ئەم کتێبەهەیە بەکوردی (کەسایەتی موسوڵمان وەک چۆن ئیسلام دایڕشتووە لە قورئان و سوننەتدا لە نوسینی دکتۆر محمد علی هاشم .

[٣] ئەم کتێبەش نەکراوە بە کوردی بەڵام لەبری ئەمە چەندین کتێب هەن بەکوردی دەربارەی ئافرەت هاتوون یەکێک لەوانە بەناوی (توندو تیژی دژی ئافرەتان ) لە نوسینی ئیدریس ژاڵەیی

٧-الرحيق المختوم لە نوسینی مبار کفوری :ئەم کتێبە بریتیە لە ژیان نامەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە شێوەیەکی کورت و ئاسان لە لە دایک بونیەوە هەتا وەفاتی، لەم کتێبەوە دەتوانیت ئاشنابیت بە شێوەیەکی خێرا بە ژیانی بەرێزترین مرۆڤ کە پێغەمبەری نازدارە صلى الله عليه وسلم.[١]

٨-صور من حياة الصحابة لەنوسینی عبدالرحمان رأفت باشا : ئەم کتێبە لە کتێبە باشەکانە دەربارەی ژیانی هەندێک لە هاوەڵان کە بە زمانێکی جوان و ئاسان نوسراوە بە عەرەبی وە زانیاریەکی زۆریشی تێدایە.[٢]

٩-ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين ؟ لە نوسینی ابی الحسن الندوي : کتێبێکی زۆر گرنگ و بەنرخە کە باس لە حاڵی سەرزەوی دەکات پێش ئیسلام چۆن ژیاون خەڵکی و پاشان بەراوردی بە هاتنی ئیسلام ژیان لەسەر زەوی چۆن گۆڕاوە.[٣]

[١] ئەم کتێبە کراوە بەکوردی بەناونیشانی گوڵاوی سەرمۆر وەرگێڕابی بەکر حمە صدیق

[٢] ئەم کتێبە نەکراوە بەکوردی بەڵام هاوشێوەی زۆرە بەکوردی وەک (ژیانی هاوەڵان ) کە سێ بەرگە لە نوسینی محمد یوسف الکاندهلوی وەرگێرانی نیهاد حبیب الله

[٣] ئەم کتێبە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی بە ناونیشانی (بەداڕوخانی موسوڵمانان جیهان چی زیانێکی لێکەوت )

١٠-مـن روائـع حضـارتنا لـە نوسـینی دکتـۆر مصـطفی السـباعی ئەم کتێـبە یەکـێکە لە باشـترین ئەو کتێبـانەی کە بـاس لـە جـوانی و بەرزی شارسـتانیەتی ئیسـلامی دەکات، کە موسـوڵمانان توانیویـانە لە زانسـتە جیاوازەکانی شارستانیەتی جیهاندا دەستی باڵایان هەبێت.[١]

کۆمەڵێـک کتێبی تـریش هەن کە دەتوانیـت دەسـتیان بخەیـت و بیـان خـوێنیتەوە لەوانە کتێبی (جـامع العلـوم والحکـم ) لە نوسـینی ئیـبن و رەجەبـی حەنبەلی، کە بـاس لە شــەرحی پەنجـا فەرمـودەی پێغەمـبەر صلی الله علیه وسلم دەکات بە شێوازێکی زۆر جوان و ڕێک و پێک .

هەروەها کتێبی العبـادة فی الإسـلام لە نوسـینی یوسـف القرضـاوي، کە کتێبێکـی بەنــرخە بە شــێوازێکی زۆر قــوڵ و بەهێـز بــاس لە واتــای عیبـادەت دەکات لە ئیسـلامدا و وە گشـتگیری دەکات لە هەمـوو ژیانـدا ڕەنگبداتەوە....

ئەمـانە چەنـد نمـونەیەکی کەمـن کە هێنـامەوە لەکتێـب ئەگینـا کتێـب زۆر زۆرەو هـی باشــترو چــاکیش هەیە بەڵام ئــێمە مەبەســتمانە کە لەسەرەتادا بەم کتێبانە دەست پێبکرێت تابێتە کردنەوەی دەرگایەک

[١] ئەم کتێبە نەکراوە بە کوردی بەڵام هاوشێوەی ئەم کتێبە کتێبی (ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستیەکاندا ) لەنوسینی دکتۆر کاوە فەرەج سەعدون یان کتێبی (هەزارویەک داهێنان ) کە ناوەندی ڕێنوێن چاپی کردوە.

بەسەر کەسەکەدا، ئەمەش بواری سێیەم لەدوای قورئان و فەرمودە کە زانستی شەرعیە.

**بواری چوارەم : خوێندنەوە لە بواری تایبەتمەندێتیدا (التخصص)**

ئەم بوارەش بوارێکی زۆر گرنگە بەتایبەت کەسانی دیندار تیایدا کەم تەرخەمـن. خوێنـدنەوە لەو بـوارە دونیـاویەی کە خـۆت تیایـدا تایبەتمەنـدێتیت هەڵبژاردووە کارێکی زۆر چاکە، بـۆ نمـوونە پزیشـک دەبێـت بەردەوام بخـوێنێتەوە لەو بـوارەی خـۆی یـان ئەنـدازیارێک بەهەمـان شـێوە یـان شـارەزایەک لە بـواری کیمیـادا یـان جوگرافیـا ... هەر جۆرە بوارێک بێت.

بخـوێنەوە بەردەوام تیایـدا هەتـا ئاسـتی زانیاریـت لەو بـوارەی خۆتـدا بەرزبێت، وە توانـاو خیبرەت لە کارەکەتدا زۆر باش بێت، بەڕاستی ئەم جـۆرە بـوارانە لە مەبەسـتە گرنگەکانن، ئـێمە نامـانەوێ کەسـێک کە ئەندازیارە واز لە بـواری ئەنـدازیاریەکە بێنێ بچێت خەریکی فـقە بێـت، یـان کەسـێک شـارەزایە لە بـواری فیزیـا واز لە فیزیـا بێنـێ و بچێـت خەریکی زانسـتی تەفسـیر بێـت، ئـێمە چەنـدمان پێویسـت بە زانایـانی شەرعناسـە بەقەد ئەوە یـان زیـاتر پێویسـتمان بە زانایـانێکە کە لە مەجالی زاستی دونیا شـارەزابن.

لەچەنــدین کــۆڕو ســیمیناری زانکۆکــان یــان لە کــاتی دەرچــونی خوێندکاران لە زانکۆ داوام لێکراوە کە ئامۆژگاری خوێندکاران بکەم، لە کاتێکدا ئەم خوێندکارانە کۆتاییان بە زانکۆ هێناوەو دەچنە ژیانی کردارییەوە لە بوارەکەی خۆیاندا، پێم وتوون کە دەزانم لەدوای ئەمە دەرچوونە سەرقاڵ دەبن بە کارکردن بۆ دروستکردنی خێزان و ماڵ، ئەمانەش کارێکی گرنگن بەڵام ئەوەی من دەمەوێ پێتانی بڵێم ئەوەیە کە داهاتووی زانستی خۆتان چی دەبێت بەرەو کوێ دەڕوات، ئایە بەردەوام دەبن بۆ بەدەستهێنانی ماجستەر و دکتۆرا لەو بوارەی خۆتان ؟ بەڵێ پێم وایە دەبێت هەمووتان هەوڵی ئەوەبدەن چونکە بۆ موسوڵمان لە پێشترە کە پابەند بێت بە دینەکەیەوەو وە لە بواری زانستی دونیاشدا دەستی باڵای هەبێت، خۆ هەر خوای گەورەو دینەکەیە پێمان دەڵێت کە سەرزەوی ئاوەدان بکەنەوە و سود بە مرۆڤایەتی بگەیەنن، ئەی ئەگەر ئەمە ئیشی موسوڵمان نەبێت ئیشی کێیە ؟ کە دەبێت هۆی ڕەزامەندی خواو پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم.

**بواری پێنجەم : کە بوارێکی زۆر گرنگە ئەویش بواری مێژوو (التاریخ).**

بێگومان خەڵکێکی زۆر باسیان لە گرنگی بواری مێژوو کردووە بە شێوازی جیاواز، خوێندن و خوێندنەوەی مێژوو زۆر جێی بایەخە، یەک لەسەر سێی قورئان ئەگەر تێبینی بکەین باس لە مێژووە، یەک

لەسەر سێی قورئان باس لە چیرۆکی پێشین دەکات، بەدڵنیایەوە ئەویش بۆ ئەوەیە کە ببێتە دەرسێک بۆ نەوەکانی ئێستاو داهاتوو، وە بیرکردنەوە لەو ڕووداو بەسەرهاتانەی هاتووە بەسەر پێغەمبەران و ئوممەتەکانیانـدا، وە لەمەشەوە دەتـوانی سوننەتی خـوای گەورە هەست پێبکەیت دەربارەی دروستکردنی مرۆڤایەتی و زەوی و هەموو جیهانی مەخلوقات.

لەگەڵ ئەو گرنگیەی مێژوو هەیەتی دەبێت ئێمە بێین ئەوانەی کە سەرەکین و پێویستن بیان خوێنینەوە پاشان بۆ بەشەکانی تر بچین، لەوانە ( سیرەی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم، پاشان مێژووی چوار خولەفای راشیدین، پاشان مێژووی ئیسلامی بەگشتی، پاشان مێژووی بێجگەلە ئیسلام و موسوڵمانان ...

بۆ دەستپێکردن بە سیرەی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم باشە کە بە کتێبی (الرحیق المختوم ) دەستپێبکرێت، کە باس لە سەرەتای لەدایک بونی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم دەکات هەتا وەفاتی بەشێوەیەکی ئاسان و کورت، پاشان دەکرێت بچیتە سەر سیرەی ئیبن هیشام و فقه السیرة ھی بوطی، و فقه السیرة ھی الغزالی ... وە زۆری تریش هەن کتێب دەربارەی سیرەی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم.

لەدوای ئەوە دەستبکرێت بە خوێندنەوەی مێژووی خولەفای راشیدین، سەرەتا بە کتێبی (إتمام الوفاء في سيرة الخلفاء ) نوسینی الخضري.[١]

دواتر پێویستە بچیتەسەر خوێندنەوەی ژیانی هاوەڵان، بۆ دەستپێکیش باشترە بە کتێبی ( صور من حياة الصحابة ) لە نوسینی عبدالرحمان رأفت باشا، ئەمە بخوێنرێتەوە.

وە هەندێک کتێبیتر هەن کە ڕۆشنایەکی زۆر باش دەبەخشێت بە خوێنەرانی لە بواری مێژووی ئیسلامیدا وەک ( ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين ؟ ) نووسینی ئەبی حەسەن نەدەوی، وە کتێبی ( من روائع حضارتنا ) نووسینی مصطفى السباعي، وە کتێبی ( حماة الإسلام ) نووسینی مصطفى نجيب ... ئەم کتێبانە کۆمەڵێک کتێبی زۆر نایابن لە کردنەوەی بیروفکرو چاوکردنەوەی موسوڵمانان بەرامبەر دوژمنانی ئیسلام کە دەیانەوێ مێژووی ئیسلام و موسوڵمانان ناشیرین بکەن.

---

[١] لەبری ئەم کتێبە لە مێژووی چوار خولەفای راشیدین ئەم کتێبە کراوە بە کوردی بە ناونیشانی ( مێژووی چوار خولەفای ڕاشیدین ) وەرگێڕانی : فاتح سەنگاوی

**بواری شەشەم : خوێندنەوە لە بواری و اقیعناسی**

ئەم بـــوارە زۆر مەترســـیدارە، لەبەرئەوەی پەیوەســـتە بە خـــودی موسـوڵمانان خۆیـانەوە، ئەگەر لێی بێئاگابن دەبنە نێچیری دوژمنـان، وە زۆریـش گـرنگە و جێی بـایەخی موسـوڵمانی داعی و چـاوکراوەیە، مەبەست لەم بوارە خوێندنەوەی ئەو واقیعەی تێیدا دەژیت، لە ڕووی سیاسی و ئـابوری و زانسـتی وە هەروەهـا خوێنـدنەوەی واقیعی جیهـان لەوڕوانەوە، پاشـــان خوێنـــدنەوەی واقیعـی ئەو وڵاتەی خـــۆتی تێـــدا دەژیت، وە خوێندنەوەی واقیعی موسوڵمانان لە جیهاندا بەگشتی.

هـیچ گومـان لەوەدانـیە کە کاتێـک گۆڕانکـاری سیاسـی لەسـەر زەوی ڕوئەدات ئەوا کـاریگەری گەورەی لەسـەر ئـوممەتی ئیسـلامی دەبێـت، ئەگەر تـــۆ دەتەوێـــت بەڕاســـتی خەم خـــۆر و پشـــتیوانی ئـــوممەتی موسـوڵمان بیـت دەبێـت شـارەزاو زانیـاری بەردەوامـت هەبێـت لەسـەر واقیعی ئەو شـوێنەی خـۆتی تێـدادەژیت وە واقیعـی جیهـانی ئیسـلامی بەگشـــتی، بێگومـــان ئەو وتەیەی کە دەڵێـــت قســـەکردن لەســـەر سیاسـەت لە شتە خراپەکان و حەرامەکانە ! ئەمە قسـەیەکی زۆر هیچ و بێمانـــایە وە زۆر دەمێکیشـــە کەس گرنگـی بۆدانـــانێ، سیاســـەت و ئابوری و بازرگانی و پیشەسازی و کشتوکاڵ و جەنگ و ئاشتی ئەمانە هەمـــووی بەشـــێکن لە ئیســـلام و لێـــی جیانـــابنەوە، هەنـــدێک لە بانگخوازان گرنگی نادەن بەم بوارە، بەتایبەت ئەوانەی کە کەنارگیری

دەکەن لە خەڵکی و لەو واقیعەی کە موسوڵمانی تێدا دەژی، وە ئەو جۆرە کەسانە نە تەئسیراتیان دەبێت و نە دەتوانن واقیعیش بگۆڕن...

پاشان تۆ دەبێت ڕۆژانە بەشێوەیەکی زۆر خێراش بێت هەوڵبدەی زانیاریت هەبێت لەسەر واقیعی وڵاتی خۆت و جیهان، بەڵام بەشێوەیەک بێت کە کاتێکی زۆرت نەڕوات بە دیار هەواڵی ناڕاستی کەناڵ و ڕاگەیاندنی سیاسی کەسانێک کە شتانێک خۆیان بەدڵیان بێت ئەوە بەتۆ دەڵێن، دەبێت ئاگاداری ئەوەش بین کە ڕاگەیاندن سحرێکی زۆر کاریگەری هەیە لەسەر هەست و فکری کەسەکان زۆر کات کەناڵی سەربە دەزگا گەندەڵ و بودەڵەکانن لەڕوی سیاسی و پەروەردەی کاریگەری سلبی دەبێت لەسەر خۆت و ماڵ و خێزانت، هەوڵبدە ئەو کەناڵانەی کە دەزانی زانیاریەکی دروستت پێدەدات پاشان بەرنامەیان دروست و گونجاوە سەیریان بکەیت لە کوردی بێت یان عەرەبی ...

**بواری حەوتەم : خوێندنەوە لە بواری بیروڕای جیاواز**

زۆر بەداخەوە خەڵکانێکی زۆر هەن کە قبوڵیان نیە بە هیچ شێوەیەک بیروبۆچونی جیاواز لەو بیرو فکرەی خۆی کەلەسەریەتی بخوێنێتەوە یان گوێی لێبگرێت، هەتا لە ناو هەندێک زانایان و بانگخوازانیشدا کە قبوڵیان نیە بیروبۆچونی جیاواز لە مەزهەبی خۆی یان قوتابخانەی فیکری جیاواز لەوەی خۆی بخوێنێتەوە، ئەوە

ئەگەر بیروفکرەکە ئیسلامی نەبێت هەرناشچن بەلایدا لەکاتێکدا ئەمە شتێکی زۆر هەڵەیە، چونکە موسوڵمان و داعی چاوکراوە دەبێت ئاگای لە بیروبۆچونی بێجگەلە ئیسلامی بێت بۆی بزانێ ئەمانە چۆن بیردەکەنەوە و بەڵگەیان چیەو بۆچونیان چۆنە، دەبێت ئەوەش ڕەچاوبکەین بەتایبەت گەنجان کە سەرەتا خۆیان پڕچەکی زانیاری بکەن لەسەر بیروفکری ئیسلامی و عەقیدەی ئیسلامی پاشان بچنە سەر بۆچۆنی جیاواز لە بیروبۆچونی ئیسلامی ...

ئێمەی موسوڵمان پێویستە بخوێنینەوە لە بیروفکری جیاواز لە بیروفکری ئیسلامی، چونکە بەبەرچاوی خۆمانەوە دەبینین کە موسوڵمانان چۆن بە جۆرەها بیروفکری جیاواز لە ئیسلام ئاڕاستەدەکرێن وەک ( نیشتیمان پەروەردی و عەلمانیەت و ئیشتیراکی و ڕۆژئاوای و نەتەوە پەرستی ) ئەمانە هەمووی خەڵکی پێ فریوئەدرێت لەکاتێکدا هەمووی بۆ سودگەیاندنە بە خودی خۆیان یان کۆمەڵێک بۆ دەست بەسەراگرتن بە ماڵ و سامان و دەسەڵاتی میللەتاندا، پێویستە بخوێنینەوە تا بزانین ئەوانە چی دەنوسن وە چۆن بیردەکەنەوە وە پلان و ستراتیجیەتیان چییە ؟، هەروەها زیاتر ئاگامان لە پلان و نەخشەی یەهودیەکان و مەسیحیەکان بێت بەرامبەر بە موسوڵمانان و ئوممەتی ئیسلامی، ئەمەش بە خوێندنەوەی

کتێبەکانیـان و وە یاداشـتەکانی سـەرۆک و دەسـەڵاتدارەکانیان وەک یاداشتەکانی نیکسـۆن و ریغـان و بـوش و کلینتـون و کیسـنجیر و دیفیـد کوک و چەندینی تر ...، تا بزانین ئەوانە تێڕوانینیان بۆ ئێمە چۆنە، وە چـۆن توانیویـانە بێـنە وولاتمـان و دەسـتبگرن بە سـەر دەسـەڵات و هێزی ئێمەدا، وە چۆن دژایەتیمـان دەکەن وە چـۆن ئاشـتیمان لەگەڵ دەکەن، ئەمـــانەش بە ڕاســـتی شـــتانێکی زۆر گـــرنگن کە زۆرمـــان پشـتگوێمان خسـتون، پێویسـتە کاتێکی بـاش و هەوڵـدانێکی باشی بـۆ تەرخان بکەین، هیچ گومان لەوەدانییە کە دەبێت بیروفکرێکی فراوان دابنێین بۆ خوێندنەوەو گوێگرتن لە بیروبۆچونی بەرامبەر هەتا باشتر بتوانین ئامانج و مەبەستمان زیاتر بپێکین.

**بواری هەشتەم : خوێندنەوە لەبواری ئەو گومانانەی کە دەوترێت دەربارەی ئیسلام و وە رێگاکانی چۆنیەتی وەڵام دانەوەیان.**

لە سـەرەتای هـاتنی ئەم وەحـیەوە هەتـا ڕۆژگـاری ئێسـتامان ژمـارەیەکی زۆر لە گومـان دروسـتکراوە دەربـارەی قـورئـان و پێغەمـبەر صـلی اللّٰه علیە وسلم و فەرمودەکانی پێغەمبەر صلی اللّٰه علیە وسلم، ئێمە هیچ گومانمـان لەوە نـیە کە ئیسـلام دینێکی تەواو کـاملە چـونکە لە لایەن خـوای گەورە نێـردراوە بە پێغەمبەرێکـی راسـتگۆو میهرەبانـدا، بەڵام دەبێـت وەڵامـی ئەو گومانـانە بـدرێتەوە کە خەڵکانێـک زۆر بەنەزانـانە کەوتـــونەتە قســـەکردن دەربـــارەی ئیسـلام لە کاتێکـــدا بەڵـــگەو

قسەکانیان زۆر دوورن لە راستی و تەنها شتانێکی زۆر نازانستی و بێ بنەمان.

لەسەردەمی ئێستاماندا گومانەکان زۆر زیاتر بوون، دەیان کۆڕو کۆنگرە دەبەسترێت و پارەیەکی زۆر و ووزەیەکی زۆر دەخرێتە کار بۆ دروستکردنی گومان و ناشرینکردنی ئیسلام لەلای خەڵکی، وە پێویستە لەسەر ئێمە کاربکەین بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گومانانە بە بەڵگەو دەلیلی زانستی و حەکیمانە.

**ئافرەت لە ڕو انگەی ئیسلامەوە چۆنە ؟**

**یان دەڵێن ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوبۆتەوە ئەمە چۆن وەڵام بدەینەوە ؟**

**یان چۆن وەڵامی ئەو قسانە بدەینەوە کە دەڵێن سزای دەستبڕین کارێکی ناشارستانیە؟**

**یان وەڵامی ئەو قسانەی دەڵێن ئیسلام دینێکە سەرچاوەی توندڕەوی و دواکەوتوییە.**

وەڵامی ئەم گومانانە پێویستی بە وەڵامێکی بەهێزو عەقڵی و مەنتیقییە کە بتوانێت کەسانی بەرامبەر قەناعەت پێبکات، بۆ ئەمەش پێویستە ئێمە بخوێنینەوە لە بواری ئەو کتێبانەی کە نوسراون دەربارەی

وەڵامی گومانەکان لەسەر ئیسلام وەک کتێبی (شبهات حول الإسلم ) نووسینی مامۆستا محمد قوطب، وە کتێبی ( حقائق الإسلام و أ باطيل خصومه) نووسینی عقاد، وە کتێبی ( الإسلام في قفص الاتهام ) دکتۆر شوقي أبو خليل ... زۆری تر هەن.

**بواری نۆییەم : خوێندنەوە لە بواری پەروەردەکردنی منداڵ.**

زۆرێک لە خەڵکی گوێ نادەن بەم بوارە گرنگە لەکاتێکدا پەروەردەکردنی منداڵ پێویستی زۆر بە بنەماو هونەر هەیە، وە کتێبێکی زۆریش نوسراون سەبارەت بەم بوارە، وەک کتێبی (تربية الأولاد في الأسلام ) نووسینی عبدالله ناصح علوان، وە زانایانی بواری دەرون ناسی منداڵان چەندین نوسین و بابەتیان هەیە.

ئێمە پێویستە بخوێنینەوە دەربارەی ئەو کتێبانەی کە نوسراون بۆ بواری منداڵان وەک کتێبی (قصص الأطفال ) هەتا بتوانین لە کاتی خوێندنەوەیان یان گێڕانەوەیان بۆیان بە شێوەیەکی جوان کە کاریگەری لەسەریان دروستبکات لە ماڵەوە بێت یان لە مزگەوت یان لە ڕێکخراوە پەروەردەیەکان ...

عەقڵی منداڵ زۆر لەوە گەورەترە ئێمە پێشبینی دەکەین، وە توانای وەرگرتنی زۆر بەهێزە، بۆیە پێویستە ئاگاداری ئەوە بین کە منداڵی موسوڵمان لەسەر ئەو ئەفلام کارتۆنانە پەروەردە نەکەین کە باس لە

توونـــدوتیژی و وروژانـــدنی هەســـتی جنســـی و خۆشەویســـتی ڕەگەزی بەرامبەر دەکات، پێویستە لەسەر بناغەیەکی زۆر زانستی پەروەردەین بکەین کە منداڵ بتوانێ ئەوەی پێی دەدەیت هەزمی بکات و لێی حاڵی بێت، وە منداڵ ڕابهێنرێت لەسەر خوێندنەوەی کتێبی پەروەردەیی، و چیرۆکی منداڵان، هیچ گومان لەوەدانیە ئەگەر ئێمە بتوانین جیلێک لەســـەر ئەو شـــێوازە پەروەردە بکەیـــن ئەوا ان شـــاء الله ئـــوممەتی موسوڵمان لە قۆناغێک دەبەینە قۆناغێکی باشتر.

**بواری دەیەم و کۆتایی : خوێندنەوە لە بواری لاوەکی و کات بەسەربردن.**

نەفسی مرۆڤ بەسروشتی خۆی توشی مەلەل دەبێت، وە پێویستی بە بواری روحی و کات بەسەربردنە، پێویستە موسوڵمان هەندێک کاتی بدەت بە بواری خوێندنەوەی هۆنراوەو وە خوێندنەوەی بواری هەوەڵی وەرزشی و سەیرکردنی کاریکاتێر و شانۆو هەندێک لەو شتانی خۆی حەزی پێیانە، بەڵام پێویستە دوو خاڵ هەیە ڕاچاوی بکات :

یەکەم : پێویســـتە ئەوەی دەیخـــوێنێتەوە یـــان ســـەیری دەکـــات لە چوارچێوەی بەرنامەی ئیسلام دەرنەچێت، بۆ نمونە نابێت شتانێک بخـوێنێتەوە وەک چیرۆکی نا ئەخلاقی، یان هانی بدات لەسەر ئەو کـــاروکردەوانەی کە زەم کـــراون، یـــان خوێنـــدنەوەی چیرۆکـــی خۆشەویستی نێوان کوڕو کچ کە پڕە لە باس و خواستی ناشەرعی ...

دووەم : ئاگاداری ئەوەبێت نابێت کاتێکی زۆری بڕوات بە و شتە لاوەکی و بێ سودانە، چونکە ئوممەتی ئێمە ئوممەتێکی بەهیممەتە.

ئەمانە دە بواربوون کە باسمان کرد، ڕاستە جێ بە جێ کردنی ئەم کارانە کاتێکی زۆر و هەوڵێکی زۆری دەوێت بەڵام دڵنیابە لەوە کە ئەنجامێکی زۆر باش و بەسودی دەبێت بۆتان ...

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی موسلیم دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت ( مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ به طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ) واتە : هەرکەس ڕێگایەک بگرێتە بەر کە بە زانست ئاوێتە بووبێت ئەوا خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

داوا لە خوای گەورە دەکەم کە ڕێگەی زانست و ڕێگەی بەهەشتمان بۆ ئاسان بکات، وە سەرکەوتومان بکات لەسەر ڕێبازی دینەکەی و وە زانستێکمان پێ ببخەشێت کە سودی هەبێت بۆمان، خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەکمان بێت.

**والسلام عليكم ورحمة الله و بركاته**

## چەند وتەیەکی وەرگێڕ لە کۆتاییدا

ئەم کتێــبەی بەردەســتت ڕاســتە لە ڕووی قەبــارەوە بچــوکە بەڵام لە ڕووی نـاوەڕۆکە وە زۆر بەهێزە، دکتـۆر راغـب السـرجانی خـوای گەورە بیپارێزێت نووسەرێکی زۆر بەتواناو پزیشـکێکی لێهاتووە لە وڵاتی مصر دەژی، خزمەتێکـــی زۆری کـــــردووە بە موســـــوڵمانان لە هەردوو بـوارەکەوە، ئەم نـامیلکەیەی کە نووسـیووە من لەدوای خوێنـدنەوەی زۆر شـتی جـوانم تێـدا بەدی کـرد کە تـازەبوون بـۆ ئەم سـەردەمە، بـۆیە هەوڵمـدا کە وەریبگێڕمە سـەر زمانی کـوردی هەتـا برایـان و خوشـکانی بەرێـز سـودمەند بن لێی، ئەم زانـا بەڕێـزە لەو نوسـینەی کە بـاس لە دە خاڵ دەکات بۆ خـوێندنی زانسـتی شـەرعی، کارێکی زۆر باشی کـردووە کە هەوڵی داوە چەنـدین کتێب و سـەرچاوە دابنێ بـۆ هەمـوو موسـوڵمانانی جیهـان ئەوانەی کە دەتـوانن زمـانی عەرەبـی بخـوێننەوە، مـن لێـرەدا ئامۆژگاری خـۆم و ئێـوەش دەکەم کە ئەوانەی زمانی عـەرەبی دەزانـن و ئەوانەی زمانی عـەرەبیش نـازانن هەوڵبـدەن بۆ فێربونی زانسـتی شـەرعی خۆیـان بکەن بە خوێنـدکار لە زانکۆی ئازادی دیراسـاتی ئیسـلامی (زادی )، کەلەسـەر تـۆڕی ئینتەرنێـت هەیە ئەم خوێنـدنە تـاکە خوێنـدنە لە کوردستان کە توانیبێتی بەشێوەیەکی ئاسـان و مەنهەجی خەڵکی فێری زانسـتی شـەرعی کـردبێـت و تـاکی موسـوڵمانی پارسـەنگی پێگەیانـدبێت، قۆناغەکـانی خوێنــدنی لە ناوەنــدیەوە دەســتپێدەکات بــۆ ئامــادەی و

پاشـان بـۆ پەیمانگـاو پاشـان بـۆ زانکـۆ، هیـوادارم گرنگی پێبـدەن و خۆتان لەسەر ئەو مەنهەجە پەروەردەبکەن ...

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

**٢٠١٨/٦/٣٠ هادی شارباژێڕی**